پەیڤێک

لەووتارەکانی مامۆستا شێرزاد

# تەقوا



## چۆن دەبیت بەموتتەقی

نووسینەوەی
لیلاف ئەحمەد غەزالی



چاپی یەکەم
٢٠٠٩
هەولێر

## ناسنامەی کتێب

ناوی پەرتوك : تەقوا چۆن دەبێت بەموتتەقی ؟ ( لەوتارەکانی مامۆستا شێرزاد )

بابەت : ئایینی

نووسینەوەی : ئیلاف ئەحمەد غەزالی

کۆمپیوتەر: نوسینگەی هیوا

چاپی : یەکەم ٢٠٠٩

شوێنی بلاوکردنەوە: کتێبخانەی حاجی قادری کۆیی

لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان ژمارەی سپاردنی ( ١٣٤٩ ساڵی ٢٠٠٩

بلاوکراوەی کتێبخانەی

حاجی قادری کۆیی

بۆ فرۆشتن و چاپکردن و بلاوکردنەوە

هەولێر – کوردستان – عیراق

(٠٧٥٠ ٤٦٧ ١٢ ٩٤ / - ٠٧٥٠ ١١٨ ١٩ ١٩ / ☎- ٠٦٦ ٢٢ ٢٣ ٨٦٨)

# پێشەكی

گەیشتن بە پلەی موتەقی بەڕاستی هەیمەتی ئەوێت ئەبێت هەوڵوكۆششی بۆ بدەین زۆر جاران پێویستیمان بەهەنگاوی كرداری دەبێت بۆ ئەوەی بەشێوەیەكی دروست و پوخت بەم مقامە بەرزە بگەین، جابۆیە لەم چەند وانەیەدا باسی چۆنیەتی گەیشتن بەم پلەیە دەكەم، چونكە سەری هەموو پەرستنەكانو فەرمانەكانی خودای گەورە گەیشتنە بەم مقامە بەرزە كە تەقوایە، بەئومێدی ئەوەی بتوانین پێش ئەوەی بمرین و دنیا بەجێ بهێڵین بائەم دەرفەتە لەدەست نەدەینو خۆمان خەریك بكەین بۆ گەیشتن بەم پلە بەرزە، چونكە خاوەنی ئەم پلەیە هەم لەدونیا سەرفراز و بەختەوەرە هەم دوارۆژیش لە (مەقعەدی صدقن) لای خودای پەروەردگار، ئەو شوێنەی خودای پەروەردگارو میهرەبان بۆ بابەتی موتەقی ئامادە كردووە.

ئەم بابەتە بەڕاستی زۆرترو چاكتری ئەوێت، تاكو جوانتر وپوختتر لێی حاڵی ببینو جێ بەجێ بكەین، بەڵام ئەمەی بەردەستان چەند دەنكە گەنمێكە لەخەرمانێك بۆحاڵی بوون و تێگەیشتن لەم بابەتە گرنگو بەپێزە، دعای خێرو سوپاسێكی زۆریش بۆ خوشكی دەست ڕەنگینم نیلاف خان، كەهەستاوە بەنووسینەوەی ئەم بابەتەو چەند بابەتێكی تریش لەخودا داواكارم دای بپۆشێ لە ناو لوتفو كەرەمی میهربانی خۆیو لەقیامەتیش لەگەڵ پێغەمبەرو یارانی حەشر بكرێت، سوپاسو دوعای خێر دەكەم بۆ هەموو ئەوكەسانەی بەم كتێبە ماندووبوون، بەتایبەتی پەرتووكخانەی حاجی قادری كۆیی، خودا نمونەیان زۆر بكات بۆ ئەوەی هەموو كات لەخزمەت دین، خوادا بنو خزمەتكاری ئیسلام بین انشاءالله.

دلسۆزتان

مەلا شێرزاد عەبدولوەهاب

١٤٣٠هـ / ٢٠٠٩ك

# بەشی یەکەم

بسم الله الرحمن الرحیم

**الحمد لله رب العالمين والصلاة والسلام على حبيبنا محمد وعلى اله وصحبه أجمعين .**

**السلام عليكم ورحمة الله وبركاته.**

**سبحان الله** هەر جارێك ئەچمە خزمەتی پێغەمبەری خوا ﷺ. ئەگەر چی پێغەمبەری خواش. ئێستا لەناومان نەماوە ، بەلاّم خۆ فەرموودەکانی ماون، خۆ ئەو قسە شیرین وئەو قسە خۆشانەی بۆ هاوەڵەکانی خۆی دەکرد خۆ هەموویان ماون ، ئەو قسانەکە هاوەڵەکانی گوێیان لێبوو، خۆئەو قسانە هەمووی کۆکراودتەوە، هەرچەند جاری ئەچمە خزمەتی بۆ ئەوەی شتێك بۆ ئێوە بێنم ، بۆنێکی خۆش . تامێکی خۆش، زانستێك بێنم، سەرم سووردەمێنێت ! **سبحان الله** لەگەورەیی ئەو پێغەمبەرەی، لەزانست و زانیاری ئەو پێغەمبەرەی، بەهەرچی لایەوە بۆی دەچم هیچ لەزانستەکەی تێرنابم، هیچ تێرنابم لەو بۆنە خۆشانەی کە لەو پێغەمبەرە دێ **علیه السلام**، فەرموودەیەکمان هەڵبژارد لەو هەموو فەرموودانەی پێغەمبەر،

یاخود بڵێین گوڵێکمان هەڵبژارد لەگوڵزاری پێغەمبەر خوا ﷺ، بۆ ئەوەی تێرتێر بۆنی بکەین، ببێتە مایەی ئەوەی جوڵە بداتە گیانمان، بۆ ئەوەی زیاتر بەرەو خواناسی بچین.

پێغەمبەری خوا ئامۆژگاری معاذی کوڕی جەبەلی دەکا و پێی ئەفەرموێ (**اتق الله حيث ماكنت وأتبع السيئة الحسنة تمحها وخالق الناس بخلق حسن**) (رواه الترمذي) چۆن ئامۆژگاری (**معاذو ئەبو ذەری**) دەکا ، ئاواش ئامۆژگاری ئێمەش دەکا، ئێستا وا دابنێ پێغەمبەر ـ ﷺ ـ واقسەتان بۆ ئەکا ،بە ئێمە ئەفەرموێ :چی ئەفەرموی((**اتق الله حيث ماكنت**)) ئەفەرمووێ: ئێوە لەخوا بترسێن لەهەرشوێنێك بن، بەتەنیا بوون یان لە ناوخەڵك بوون، لە گەشتدا بوون، یان لە ناو شار، لە بازاڕدا بوون یان لە ماڵی خۆتان دا بوون ئیشتان دەکرد یان بێ کار بوون ، نەخۆش بوون یان ساغ بوون؟ لەهەر حاڵەتێك بوون ئێوە لەخوا بترسێن ،پاشان فەرمووی : ((**وأتبع السيئة الحسنة تمحها**)) هەرخراپەیەکت کرد چاکەیەکی لە دوا بکە، بۆ ئەوەی ڕەشی بکاتەوە، پاشان فەرمووی :((**وخالق الناس بخلق حسن**)) لەگەڵ خەڵکیش بە جوانترین خوڕەوشت بجوڵێنەوە، هاتینە سەر کۆمەڵی یەکەم، بەشی یەکەمی فەرموودەکەی پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ :((**اتق الله حيث ماكنت** ))تۆ، لەخوا بترسێ تەقوای خوا بکە، لەهەر شوێنێك بی ، تەقوا ئەوە بوو گوتمان : تۆ لە بەینی خۆت

ولەنێو خەشمی خوا، لە  نێوان خۆت و لـە نێـوان تـوورە بـوونی خـوا شتێك هەبێ ، تەماشاکە،

دووربێت لەم فەرمووده، دەبینی ئۆتۆمبێل قایش قـورەکی پێوەیـە، ئەو قایش قورە پێی نەگوترێ(واقیە)، ئەو پارێزەرە چیە ؟ پارێزگـاری ئەو (دەعامیە) وئەو (چاملغە)و ئەو ئاسنە دەکـا لـەو قورانـەی لـە تایەکـە دەردەچـن بـۆ ئـەوەی نـەرژێن ، هەرشـتێك ببێتـە مایـەی پارێزگاری شتێك لە شتێکی تر، ئەوە پێیدەڵێن واقیـە ، کـە نایـەڵێ ئەو شتەی پشتەوەی خەراپ ببی، یان کاریگەری لەوشتە بکات، . جا تەقوا ئەوەیە لەنێوان خۆتو خوا شتێك هەبێ کە خـوا غـەزەبت لـێ نەگرێ ، ئـەو شـتەش وەکـو گوتمـان چیـە ؟  جـێ بـە جـێ کردنـی فەرمانەکانی خوایە ، هەروەها دوورکەوتنەوەیە لەو شتانەی کە خوای گەورە نەهی لێکردیە و حەرامی کردووە، پێناسەی زۆری تەقوا کراوە یەك لە پێناسەکانی ئەوەیە دەفەرموێ : خوای گـەورە لـەو شـوێنانە بتبینێ کە پێیخۆشە، لەو شوێنانە نەتبینی کە پێی ناخۆشە .. ئـەوە پێناسەیەکە " هەر شوێنێك خوا پێی خۆشـە لـەوێ بتبـینێ، خـوای گەورە لە ناو مزگەوتەکاندا بـابتبینێ ، خـوای گـەورە لـەناو کـۆڕی زانست وزانیاری بتبینێ،خوای گـەورە بـا لـە نـاو نوێـژی بەکۆمـەڵ بتبینێ، خوای گەورە لەگەڵ فەقیرو هـەژارو لـێ قـەوماوان بتبـینێ، خوای گەورە با بتبینی دەسـتت پـارەی تێدایـەو بـەزەیی بـە هـەژار

دەکەی، هەژارو هەتیوان لە بیر ناکەی ویارمەتیان ئەدەی ، خوا بابتبینێ کەئەچی سەر لە ماڵێکی هەژار ئەدەی، سەردانی ماڵی دایك هەتیوێك دەکەیت، یان دەچی ئیشێکی خێر دەکەی، خوا نەتبینی لەو شوێنانەی کە پێی ناخۆشە، با خوا نەتبینی لە ڕەش بەڵەك ، باخوا لەیانەیەکان نەتبینی، باخوا نەتبینێ لەو شوێنانەی کەوا دوژمنایەتی خوای لێ ئەکرێ ، باخوا نەتبینی لەو دانیشتنانەی کەغەیبەت و بێشەرعی تیا ئەکرێ ، باخوانەتبینی لەو بازاڕانەی قۆڵی خەڵکی تێدا ئەبڕدرێ، باخوا نەتبینێ لەو شوێنانەی زوڵم و ستەم لەخەڵکی دەکرێ، ئەوە تەقوایە، ئەو شتانەی کە خوا پێی خۆشە لەو شوێنانە خوا بتبینی، خوا نەتبینی لەو شوێنانەی کە پێی ناخۆشە ..جا گوتمان ئەو تەقوایە وەسیەتی خوایە بۆ ئێمە.

خوای گەورە ئەو رب العالمینە، وەسیەتی ئێمە دەکاو دەفەرمووێ ﴿وَلَقَدْ وَصَّيْنَا الَّذِينَ أُوتُواْ الْكِتَابَ مِن قَبْلِكُمْ وَإِيَّاكُمْ أَنِ اتَّقُواْ اللّـهَ﴾ (النساء : ١٣١). وەسیەتمان کردیە بۆ میللەتانی پێش ئێوەو ئێوەش ((وایاکم أن اتقوالله )) لەخوای گەورە بترسێن ،گوتمان هەموو پێغەمبەرەکان هاتبن، ئیلا راسپاردەی قەومەکەی خۆیان کردیە ، هیچ پێغەمبەرێك نەهاتووە، ئیلا راسپاردەی کۆتایی ئەو پێغەمبەرە بۆ میللەتەکەی ئەوە بووە ((اتقوالله )) ئەوەتا خوای گەورە ئەفەرمووێ ﴿كَذَّبَتْ قَوْمُ نُوحٍ الْمُرْسَلِينَ* إِذْ قَالَ لَهُمْ أَخُوهُمْ نُوحٌ أَلا

**تَتَّقُونَ** ﴾ (الشعراء:١٠٥-١٠٦) گەلی نوح پێغەمبەر نوحیان بەدرۆزن دەردێنا ،دەیانگوت : تۆ پێغەمبەر و نێردراوی خوا نی .. بەلاّم ئەو چی پێدە گوتن (( اذقال لهم اخوهم نوح الا تتقون ))جا هەموو پێغەمبەرەکان کەهاتن چ پێغەمبەر((**هود**)) بێ چ پێغەمبەر ((**صالح** )) بێ چ پێغەمبەر ((**لوط**))بێ چ ((**عیسا** )) بێ چ((**موسا** )) بێ چ((شوعەیب)) بێ ، هەر هەموویان ﴿**إِذْ قَالَ لَهُمْ أَخُوهُمْ لُوطٌ أَلا تَتَّقُونَ**﴾ الشعراء/ ١٦١هەر پێغەمبەرێك هاتبی تەنها راسپاردەو و ئامۆژگاری بۆ میللەتەکەی خۆی ئەوە بووە، لەخوا بترسن ... پێغەمبەری ئێمەش سەردارو سەروەری ئێمەش ،تاجی سەرمان ، گلۆپی دڵی ئێمەش ﷺ لەهەموو ئامۆژگاریەکانی ئامۆژگاری، هاوەڵەکانی وئێمەشی کردووە، کە لەخوای گەورە بترسێن لەوتارەکەی((**حجة الوداع** )) دەفەرموێ (( اوصیکم أیها الناس أن اتقوا الله والسمع والطاعة )): واتە: ئەی خەلکینە گوێتان لێبێ وەسیەتیان دەکەم، لەخوای گەورە بترسێن، گوێڕایەلیتان هەبێ بۆ خواو بۆ پێغەمبەروبۆ سەرۆکەکانتان ، جا ئەوە راسپاردەی پێغەمبەرە ، هەر جێنشنەکانی ڕاشیدین، هەر هەموو پیاو چاکەکانیش ئەگەر هاتبن ئیلا .. راسپاردەی گەلەکەی خۆیان کردوە، تەقوای خوای گەورە بکەن ، باشە ئەوە زانیمان راسپاردەی خوای گەوردیە ، هی هەموو پێغەمبەرەکانە ، هی هەموو پیاو چاکەکانە ،

تەقوای خوا بکەن ،بەڵام باشە تەقوا چۆن بکەم ، وایە ..یان ..نا؟ چونکە ئێمە زۆر گوێمان لێدەبێ، من بەخۆم پێش ئەوەی ئەمە بخوێنمەوەو فێرە ئەم زانستەبم، گوێم لێدەبوو دەیانگوت کاکە لەخوا بترسێ ((اتقوالله )) گوێم لە مامۆستایان دەبوو، بە خەڵکیان دەگوت لە خوا بترسێن ، بەڵام فکرم دەکردەوە دەمگوت دەبێ، تەقوای خوای گەورە چۆن بێ، تاکو جێبەجێی بکەم ، منیش ببم بە موتەقی ، دەبێ خاسیەتی ئەو موتەقیانە چی بێ ، هەتا خاسیەتەکانیان هەڵبگرم و تەتبیقی بکەم، بزانن ئەوەی موتەقی بی وەلییە، بەپێی ئایەتی خوای گەورە ﴿أَلا إِنَّ أَوْلِيَاء اللّهِ لاَ خَوْفٌ عَلَيْهِمْ وَلاَ هُمْ يَحْزَنُونَ * الَّذِينَ آمَنُواْ وَكَانُواْ يَتَّقُونَ﴾ یونس/ ٦٢- ٦٣. هەرچی موتەقی بێ، دەبێ بزانێ کە ئیماندار پلەی ویلایەتی لە رب العالمين وەرگرتووە ، جا بابزانین لەبەر چی ئەوەندە پێداگیری کراوە لە سەر ئەوەی کە تەقوای خوای گەورە بکەن ، من گەڕام لە قورئان دوو هۆکاری زۆر سەیرم دیتەوە ، یەکەمیان تەقواجوانترین جلە کە مرۆڤی موسڵمان لەبەریکات ، جل ئەوەیە خەوش‌و نەنگی مرۆڤ دادەپۆشی ، هەر مرۆڤێك بێنە شەکی لەبەر بکەوە زۆر ناشیرینە ، زۆر ناڕێکە ، هەتا گیانەوەر بەگیانەوەرەی خۆیان، ئەگەر موویان پێوە نەبێ زۆر ناڕێك وناشیرینن، جا خوای گەورە مرۆڤی لەگیانەوەر جیا کردوّتەوە بەچی ؟ بە جل‌و بەرگ.. یەك لەو شتانەی ئێمەی لە گیانەوەر جیا

کردۆتەوە، ئێمە جل لەبەر دەکەین ، ئەو جلە هەموو خەوش‌و نـەنگی دادەپۆشـێ ،دەی باشـە ئـەوە خـەوش‌و خاریـەی دەرەوەمـان . ئـەی خەوش‌و خاری دڵ ودەروونمان ،ئەی عەیب وعاری رووحەکانمان ، ئـەی خەوش‌و خاری ئەم دڵەی کە لەناو لاشەمانە چ دایپۆشێ ؟ تـەقوا دای ئەپۆشێ . چونکە بزانن تۆ کە گوناهێك ئەکەی ڕاستە خاڵێك لەسـەر ڕوومەتت ڕەش نابی ،**سبحان الله** .. یـەك لـە بەخشـشەکانی گـەلی **محمد المصطفی** ـ ﷺ ـ ئەوەیە ئەگەر گوناهیش بکا، لیـی بـە دیـار ناکـەوێ لەبـەر فـەزڵ وگـەورەیی ، ڕۆژێکیـان هاوەڵێـك لەخزمـەتی پێغەمبـەر ـ ﷺ ـ دانیـشتبوو فـەرمووی : خۆزگـە ئەگـەر یـەك گوناهی دەکرد، خوا سزای ئـەدا، چـۆن سـزای میللەتـەکانی تـری داوە!، پێغـەمبەر ﷺ فەرمووی : نا.. وا مـەڵێ . گوتی :لەبەرچی ؟ گوتی: میللەتەکانی پێش ئێوە، ئەگـەر گوناهیـان بکردبـا لـە سـەر دەرگەیان دەنوسی، فریـشتەکان دەهـاتن بـە فـەرمانی خـوا لەسـەر دەرگەیان تۆمار دەکرد، ئەوکابرایە ئەو گوناهەی کردووە ، جا ئەگەر بێت‌و حاشای لێکردبا، یان بیشارباوە ئەوە هەر لەدنیاو ڕۆژی دوایش فەزح دەبوو بەڵام ئەگەر بەئاشکرا بچوبایە لای پێغەمبەری بیگوتبایە ئەی پێغەمبەر خوا ئەو گوناهەم کردیـە، ئینجـا خـوای گـەورە لێـی خۆش دەبوو، بەڵام ئێمە ئۆممەتی ئەو محەمەدە گەورەیـەین سـەنا بـۆ خوای گەورە بۆ کێیە ئەوها نیە ، خوای گەورە، ئابروومان نابا، خوای

گەورە ئەسڵەن ئەگەر یەکێك گوناهی کرد هەر خوا بۆ خۆی حەز دەکات گوناهەکەی بشارتەوە، هاوەڵ هەبووە ـ ڕەزای خوای لێ بێ ـ شەیتان غەلّەبەی لێ کردیە تووشی زینا بووە، هاتە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: یارسول الله ، زینام کردوە. پێغەمبەر ڕووی لێ وەرگێرا لەبەر چی؟ حەزی نەکردیە دیاری بخا، حەزی نەکردیە لە ناو خەڵکی شەرمەزار بی ، باهەر تەنها خوا بیزانێ تەوبە بکاو خوا لێی خۆش دەبێ، جا فەزڵ وگەورەیی لە بۆ ئەو خودایەی، کە ئێمە گوناهدەکەین خوای گەورە نەلە دەرگەمان دەنووسی، نەلە ڕوخسارمان بەدەردەکەوێ، بەڵام دڵمان ڕەش دەبێ، دڵمان کاوڵ دەبێ پێغەمبەر(ﷺ)دەفەرموێ : هەرکەسێك گوناهێك بکات، خالێکی ڕەشی لەسەر دڵی پەیدا ئەبێ ، هەرگوناهی کرد، هەر خاڵی ڕەش پەیدا ئەبێ ، بەڵام ئەگەر تەوبەی کرد هەموو ڕەشاتیەکە ئەڕوا و دڵێکی ساف وبێگەرد ئەمینێتەوە، باشە .. ئەو دڵە چ جلێکی لەبەرکەم، چ پۆشاکێکی جوانی لەبەربکەم، بۆ وەی هەموو خەوش و ئەنگی داپۆشم ڕەشاتیەکەی نێڵم دیاربی، ئەوەیە جلی تەقوای لەبەرکا، خوای گەورە ڕوو لە ئێمە:: ﴿يَا بَنِي آدَمَ قَدْ أَنزَلْنَا عَلَيْكُمْ لِبَاسًا يُوَارِي سَوْءَاتِكُمْ وَرِيشًا وَلِبَاسُ التَّقْوَىٰ ذَٰلِكَ خَيْرٌ﴾ (الاعراف:٢٦) ئەکا ئەفەرمووی ئەی بەنی ئادەمینە خوای گەورە بۆ ئێوەی ناردۆتە خوارێ چی ؟ جلێك ،پۆشاك کە لە بەریکەن (وریشا)

ریش ئـەوەی کـە کراسـەکەی پـێ جـوان ئەکـەن ،جـوانی ئەکـەی و ئەیبریقێنیەوە ڕیك وپێکی ئەکەی ،خوای گەورە ئەو شتە جوانەی بـۆ ئێوەی ڕەوانە کردووە بۆ وەی خەوش و خاری پێ بشارنەوە ((ولبـاس التقوی ذلك خـیر )) دەفەرموێ : بەڵام لە فکر مەکەن تەقوا باشـترین جلە لەبەریکەن، یەك لە شاعیرەکان دەڵێ ( اذا المرء یلبس ثیابـا مـن التقوی، تقلب كاسیا وان كان عریانا، وخیر لباس المرء طاعة ربه، ولا خیر في من كان لله عـاصیا) بەڕاسـتی ئـەو شـاعیرە جـوانی گوتیـە، دەفەرموێ : ئەگەر هەر کەسێك لیباسی تەقوای لەبەر بکـا ، ئەگـەر بێتو لە ناو خەڵکی دا ڕووت و قوتیش بی، بەڵام ئـەوە هـەر لاشـەی دیار نیە هەر خەوش وخارەکانی دیار نیە ، لەبەر ئەو تەقوایـە هـەم رووی دەرەوەی هەم ناودوەشی داپۆشیوە ، پاشان دەفەرموێ : باشترین لیباس ئەوەیە کە خەڵك لەبەری بکاتن تاعەتی خوا بکاتن، لیباسـی تەقوای لەبەربکا ، بەڵام باهەر خەڵك جلی لەبەر بـێ ، بـەڵام ئەگـەر جلی تەقوای لەبەر نەبوو، ئەوە هەر ڕووت و قوتە و هیچی لەبەر نیە، هۆی یەکەم ـ ئە وەیە کە خوای گەورە تەقوای کردۆتە لیباس بۆ نـاو دڵ ودەروغان، هۆکاری دووەم ..خوای گەورە بە (**خیرزاد**)ناوی بـردووە ،(**زاد**) ئەوەیە کە ژیانی تێدایە، کە قوتی تیایە ،تە ماشـاکە ئەگـەر مرۆڤێك نان نەخوات دەمرێت..ئەویش ؟! تەنها لاشەکەی پـێ قەڵـەو دەبێ، باشە ئەدی خۆراکی گیانم ؟ ئەدی خۆراکی ڕۆحم ؟ **سبحان الله**

ئەوەندەی ئێمە گرنگی بە دەرەوە دەدەین، گرنگی بە ناوەوەی خۆمان نادەین، ئەوەندە، دەبچیتە پێش ئاوێنە پرچت دادەینی ، دەم و چاوت دەشۆی، هیچ نەنگی نیە ؟ نەخێر ئەو جا دەچیە دەرێ . بەڵام ڕۆژێك نەهاتی دانیشی نە ینۆكێك بێنی دانێی تەماشای ناو دڵ و دەروونی خۆت بكەی ، ئەدی بزانم دڵم ساختەی تێدایە، ناپاكی تێدایە ،حەسودی تێدایە ،دووبەرەكی تێدایە، بوغزی تێدایە ، ئایا غەمی گوناهم هەیە ؟ ئایا نیەتم هەیە، بچم گوناهێك بكەم، نەخێر! ڕۆژێكیان دانانیشین ئەو دڵەی خۆمان پاك بكەینەوە ، ئەم دڵە پێویستی بەخۆراك هەیە ، ئەگەرنا ئێمە هەموو دڵمان مردووە ، باشە خۆراكی ئەم دڵە چیە ؟! خۆراكی ئەم دڵە تەقوایە ! ئەوانەی خۆراك زۆر ئەدەنە دڵیان، دەزانی ڕوحیان بەهێز ئەبێ ، دەزانی دڵیان منەوەر ئەبێ، دڵەكانیش چاویان پێوەن ! ئێمە چاوی دڵەكانمان نوقاون هیچ نابینن كوێرن ، تەنها ئەو دوو چاوەمان شت ئەبینێ ، بەڵام ئەوەی چاوی دڵی بوویتەوە، شتی زۆر غەریب ئەبینێ ، شتی وا ئەبینێ ئێمە نایبینین ، ئەوان پێیان ئەڵێن ئەولیاء پێیان ئەڵێن موتەقی . بۆیە موتەقی وەلییە، وەلیش موتەقیە، لەبەرئەوەی چاوی دڵی بوویتەوە ، با نمونەیەكتان بۆ بهێنمەوە، ئیمامی أحمدی كوڕی حەنبەل ڕەزاو ڕەحمەتی خوای لێبی ـ كاتێك كە تووشی ئاشوبێك بوو ، پێش ئەوەی تووشی فیتنەكە بێ پێغەمبەری لەخەودا دیت علیە

الصلاة والسلام، ئەو ئیمامە بەڕێزە هەموو شەوێ پێغەمبەری لە خەودا نەدیتبایە دەیگوت: بوویم ەمونافیق، هەموو شەوێ دەبایە بگاتە خزمەت حەزرەتی رسول الله ﷺ، ئەوە ئیمان و تەقوایە ، شەوێك پێغەمبەر هاتە خەونی فەرمووی : ئەی أحمد تووشی فیتنەیەك ئەبی، بەڵام سەبرو ئارامت هەبی، ئەوە پێغەمبەر پێی گوت : علیه الصلاة والسلام پێغەمبەریش ئەفەرموێ : ئەگەر من بێمە خەونتان، ڕاستەو هیچ گومانی تێدا نیە ، شەیتان ناتوانی شێوەی وەکو من لێ بکاو بێتە خەونتان ، دەکەواتە خەونەکەی ڕاستە، ئیمامی أحمد لە سەردەمی یەك لەخەلیفەکان تووشی فیتنەیەك بوو، فیتنەکەش خەڵقی قورئانی پێدەڵێن : ئیمام أحمد دانی پێدا نەنا گوتی : نەخێر.. ! ئەم قورئانە (مەخلوق) نیە ئەم قورئانە قسەی خوایە و ئەزەلیە، بینەو بەردەو هینایان وبردیان نەیسەلماند، هەموو خەلکی بەغداش چاوەڕوانی دەمی أحمدی کوری حەنبەڵ یان دەکرد بزانن ئەو فتوای چ دەدا... زانا ئەگەر بێت و خلیسك ببا یەك ئوممەت خلیسك دەبا ، بەڵام ئەگەر کەسێك خلیسك ببا هیچ نیە و بەردەبێتەوە ، بەڵام ئەگەرزانایەك خلیسکی برد یەك ئوممەت بەردەبێتەوە ماڵی کاوڵ دەبێ ، دانیپێدا نەنا ، لەکۆتایی بڕیاریاندا کە سەد داری لێبدەن ..سەد داری لەپشتی بدەن ، کە هینایان شەڕوالی لەبەر بوو، دۆخینەکەشی لیقەیم کرد بوو لەگەڵ عەبایەکی

لەبەر کرد بوو، ئەو خەلیفەیە چی لێکرد ؟ دەجەلاّدی هێنا ، گوتیە : جەلاّدەکان هەر یەك لە ئێوە دە داری لێدەدەن ، یەك جەلاّدی نەهێنا سەد داری لێبدا ، لەبەر ئەوەی نەوەك ماندووبی و داری پەنجا هەتا سەدی بەشلی لێبدا ، بەلّکو هەر دە کەس دە داری لێبدا، زۆر بە ئێشە ، ئیمام أحمد کە دانیشت لە بۆ ئەو کابرایەی پشتیان ڕووت کردەوە لێیدەن، ئەو نزایەی کرد، فەرمووی : ((یارەبی خوایە عەورەتم بەدیار نەکەوی هەر ئەوندە ، لەبەر ئەوەی لەگەلّ لیدانی جلەکانی دەدڕێت، مرۆڤ خەوش‌و وخاری بەدیار دەکەوێ ، ئەوەندە بەئابروو بەشەرم بوو ئەوندە بەناموس بووە ، پێی ناخۆش بووە لەکاتی لێدانی هیچ عەیب وخاری بە دیار کەوێ ، کابرا هات دە داری یەکەمی لێدا هیچ نقەی نەکرد ، دە داری دووەم لەناوەندی دا دۆخینەکەی پسا ، کە پسا شەڕوالّەکەی ئاوا ڕاوەستا ..! شەروالّەکەی راوەستا بەرنەبۆوە ، دۆخین پسایە شەڕوالّیش لێك بویتەوە بەریش نەبۆوە، خەوش‌و خاری بەدیار نەکەوت! لەو کاتە دا کەلّێیان دەدا تەبعەن پشتی خوێن فریشقەی دەکرد، لە پشتی دەهاتە دەرێ، پێدەکەنی ، چەند داریان لێ دەدا، پێدەکەنی ئەو هەموو تەلّەبەشی هەبوو، هەموو لە پڕمەی گریانیان دا، ئەو پێی دەکەوت، قوتابییەکانی هاواریان دەکرد ، ئەویش پێدەکەنی، ئاخیری کە لێدانەکەی تەواوبوو جیایان کردەوەو بەهۆش خۆی هاتەوە چونکە

لەهۆش خۆی چوو بوو ، گوتیان : یانیمام زۆرمان پێ سەیر بوو بەس پێمان بڵێ تۆ بە چ پێدەکەنی ..! بەس پێمان بڵێ ئێمە لە پرمەی ناڵەو شینمان بوو تۆ بەچ پێدەکەنی ..! زەردە خەنەیەکی لێ هات گوتی: قوتابییە خۆشەویستەکانم، ڕاستە ئێوە کاتێك لێیان دەدام تەنها ئێوە دەستی جەلادەکەتان دەدیت بەهێزو توانای خۆی لەپشتی منی ئەدا ، گوتیان : ئەرێ واللە .. گوتی : بەڵام من هەردوو دەستی قودرەتی ((رب العالمین))م دەدیت، سبحان اللە ئەوە کەرامەتە هەم نزاکەشی گیرا بوو، هەم خوای گەورە عەورەت و دامەنیشی پاراست و بەدیار نەکەوت ، هەم خوای گەورە کەرامەتێکی وای پیشاندا، کە ئەو کابرایە هەرچەندی لێیدەن گوێی لێ نەبی ، جا بەحەقیقەت باشترین خۆراکی ڕوح تەقوایە ، باشترین خۆراکی دڵ تەقوایە ، ئەوەندەی بەهێز بکەی، ئەوەندە ئەم ڕوح بە هێز دەبێ ، تەماشاکە بۆیە دەڵێم، ئێمە ڕوحمانو دڵمان مردووە، سیسەو لاوازە، خواردنی نادەینێ .. ئەگەر بێت لەکاتی تەراویحدا، خۆی وا باشە مرۆڤ لەمانگی ڕەمەزانن لەگەڵ ئیمام یەك خەتم بکا ، یەك خەتمی ڕێك وپێك لە تەراویحەکاندا بکا، بەڵام ئێمە ناتوانین، ئەستەمە ئێمە بتوانین، نەك ئەوە ئەگەر مامۆستایەکە لە هەر ڕکعاتێك دە ئایەت بخوێنی، قاچمان دەلەرزی لەبەرچی..؟ چونکە ئیعتیمادی ئێمە لەسەر ڕوح نیە لەسەر لاشەیە، لاشەش لاوازە خۆمان ڕاناگرین، بەس ئەوەی

ڕوحی بەهێز بێ لاشە هەر قیمەتی نیـە، ئەسـڵەن ڕوحەكـە لاشـەكە هەڵدەگرێ، نە دەجوڵێتەوە نە ئاگاشی لەماندوو بوونە، نە ئاگـای لـە قاچی خۆیەتی، بەڵكو بەهێزو قوەتی ڕوحی خـۆی ڕاوەسـتاوە، نـوری قورئـان لـەدڵی ئـەدا ئـەو مامۆسـتایەی قورئـان دەخوێنـێ ئـەوا درەوشانەوە قورئانەی لـە دڵـی ئـەداو، هـیچ ئاگـای لـەوە نیـە كـە مامۆستا چەند ئایەتی خوێندوە، ئەوە بەكاریگـەری ڕوحـە .. بـەڵام ئێمە ناتوانین، لەبەرەوەی خـۆراكی دڵمـان لاوازە، جـا بۆیـە ئەوەنـدە گرنگـی پێـدراوە ، بۆیـە خـوای گـەورە راسپاردەی كـردوە هـەموو پێغەمبـەران راسـپاردەیان كـردووە ، پێغەمبـەرمان راسـپاردەی كردووە، هەموو پیاو چاكێك كاتێك نامـەیان بـۆ یـەكتری ئەنوسـی، یەكەم قسەی ئیمامەكەو پیاو چاكەكە بۆ برادەرەكەی خۆی ئەوە بـوو كەوا راسپاردەی خوای گەورەت لـێبێ، تەماشـاكە ئەمەیـە خـۆراكی ڕوح .. خوای گەورە ئەفـەرموێ ﴿وَتَزَوَّدُواْ فَإِنَّ خَيْـرَ الـزَّادِ التَّقْـوَى وَاتَّقُونِ يَا أُوْلِي الأَلْبَابِ ﴾ البقرة/ ۱۹۷. واتـە: ئێـوە زادو زەخـیرە خڕكەنەوە ، بەڵام چ زادو زەخیرەیەك؟ خـودای میهربـان ئەفـەرموێ (خير الزاد التقوى) واتە: باشترین خـۆراكیش كـەئێوە كـۆی بكەنـەوە تەقوایە .. بۆ وەی رووح وگیانتان پێی بەهێز بێ .. خوای گـەورە لـە قورئاندا ئەفەرموێتن ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ اتَّقُواْ اللّـهَ حَـقَّ تُقَاتِـهِ وَلاَ تَمُوتُنَّ إِلاَّ وَأَنتُم مُّسْلِمُونَ﴾ ال عمران/۱۰۲. واتە: ئەی خەڵكینە ئـەی

ئەوکەسانەی باوەڕتان هەیە، ئێوە هەقی تەقوای خوای گەورە بدەن ، دە واللەی ئێمە کەسمان هەقی تەقوای خوای گەورە نادەین ، کەسمان لەو ئەندازەیە نینە، کە ئەم هەقەی کەتەقوا، هەقی خوایە لە سەر بەندە ئێمە بیدەین وبتوانین باشترین تەقوای بکەین . بەڵام بابزانین بە چ شێوەیەك ئەتوانین ئەم تەقوایە جێ بەجێ بکەین ؟ ئیمامی غەزالی رەحمەتی خوای لێ بێ ـ ئەفەرموێ: ئەو کەسەی دەیەوێت ..تەقوا بکات، با پێنچ شوێنان بپارێزی، ئەگەر بتوانی ئەم **پێنچ** شوێنە بپارێزی، باشترین تەقوا دەکات، فەرمووی: **یەکەمینیان: چاوە، دووەمینیان دەمە، سێیەمینیان گوێیە، چوارەمیان دڵە، پێنجەمیان گەدەیە،** ئەم پێنچ شوێنەت ئاگالێ بێت تووشی گوناه نەبیت، فێری تەقوا ئەبیت ، تۆ فێری ئەو شتە ئەبی کەخوای گەورە راسپاردەی بۆکردوەو پێغەمبەران راسپاردەیان بۆکردوە ، **یەکەمینیان** زمان کە مرۆڤ بیپارێزێ لە بیستنی غەیبەت لەقسەی ناشرین ، **دووەمیشیان** چاو بپارێزی لە نەزەر لە عەورەتی خەڵك، لەخەوش و خاری خەڵك ، **سێیەمینیان** گوێ بپارێزی لەغەیبەت و لەقسەی ناشرین و لە گۆرانی نارێك وپێك ، **چوارەمینیان** : دڵی خۆی بپارێزی لە وەسوەسەی خراپ بیپارێزی لەحەسودی لەبوغزو دووبەرەکی ، **پێنجەمینیان** : زگی خۆت بپارێزی لە هەموو حەرامێك، ئەو شتانە ئەگەر بکەی، ئەو کاتە تۆ فیراسەتت بۆدروست ئەبێ ، فیراسەتیش

بەشێکە لەو خەلاتەی کەخوای گەورە ئەیدا بە ئەولیایـەکانی ، بۆیـە بۆ نمونە پێش ئەوەی شـتێك ببـێ یـان شـتێك ببینـێ یەکسـەر ئـەو پێشبینی کردنی بۆدروست ئەکاو هەستی پێ ئـەکاو ئـەڵێ ئاوایـە ، نمونەیەکی بچوك بێنینەوە هەرچـەند ابـن القیم الجوزیـة زۆری نمونـە هێنایتەوە، بەڵام نمونەیەکی بەسادەی ئیمام شافیعی ـ رەحمەتی خوای لێبێ ـ لەگەڵ برادەرەکی پێکەوە دەرۆیشتن، کابرایەکیان بینی ئیمـام شافیعی گوتی : دارتاشە برادەرەکەی کە لەگەڵی بوو گـوتی : نـەخێر ئەوە ئاسنگەرە .. گوتی : ئەوە دارتاشە..گوتی :نـەخێر ئاسـنگەرە. بانگیان کرد : وەرە کاکە ئەتۆ دارتاشـی یـان ئاسـنگەری . گـوتی : واللـەی مـن ئاسـنگەر بـووم، بـەڵام هەفتەیەکـە بووبمـە دارتـاش، هەردووکیان راستیان کرد فیراسەتی هەردووکیان تـەواو بـوو، ئەگـەر خۆت بپارێزی لەتاوانی چاو لە دەم لەگوێ لە دڵ و لەگەدەت لە حەرام خواردن، فیراسەت بۆ دروست ئەبێ وە تەقواشت بـۆ دروسـت ئـەبێ، بەڵام چەند خاڵێك هەنە با ئەم خاڵانـە ئەگـەر بـەکورتیش بـێ بـاس دەکەم، ئەم خاڵانە مەرجن کە تەقوات بۆدروسـت بـێ ، ئـەم خاڵانـە مەرجن کە ئەتۆ ببیە مرۆڤێکی موتەقی ، یەکەمین شت کە بۆ ئەوەی مرۆڤ ببێ بە موتەقی وفێرە تەقوا بێ ئـەبێ (محبـة الله) لـە دڵ دابـێ خوات خۆشبوێ، جا انشاالله باسی دەکەین، خۆشەویستی خوای چۆن دروست ئەبێ، یاخود بەشێوەیەکیدی ﴿لماذا نحب الله﴾ لەبەرچی ئێمە

خوامان خۆشدەوێ ؟ کاتێك خوات خۆش ویست بە خۆشت نازانی چۆن خۆت لە گوناهان ئەپارێزی بە خۆشت نازانی، لۆ ئەو بەندایەتیەی ئەکەی، لە بەرنەوەی عیشق وەت لێدەکا دەتفرێنێ هەموو شتێکت پێدەکا ، دووەمین شت: خوای گەورە بکەیتە چاودێر لەسەر خۆت، هەردەم خوای گەورە دەفەرموێ : ﴿ان الله كان عليكم رقيبا ﴾ لەسورەتی النساء رەقیب ئەوەیە ئاگای لە تۆ بێ ، بۆیە لە قوتابخانە لەهۆبەیەك قوتابییەك نارەحەتە، چاودێرمان هەیە، چاودێر ئەوەیە کەس ناوێری ببزوێتن، ناوی دەنوسێ و دەیداتە مامۆستا، چاودێری تۆ با "رب العالمين " بێ، هەموو کاتێ هەست بکا خوای گەورە تەماشای دەکا، دەوێری گوناه بکات ؟ جا بۆیەساحێبی کتێبی (جامع العلوم والحكم) لەراڤەی فەرموودەیەك دێنێتەوە ئەفەرموێ : خوای گەورە وەحی لە بۆ یەك لە پێغەمبەرەکانی خۆی نارد فەرمووی: بەمیللەتەکەی خۆت بڵێ باشە بۆ ئێوە کاتێك کە گوناه دەکەن، لەخەڵکی دەیشارنەوە لە من نایشارنەوە، واتان دەزانی من ناتانبینم، دەفەرموێ : هەرکەسێك وابزانێ من نایبینم، بێ باوەڕ دەبێ ، باشە ئەگەر دەزانێ من دەیبینم توخوا شەرم ناکا ئەو گوناهەی ئەکا ؟ کاتێ تۆ ئەو هەستەی بکەی بۆیە پێغەمبەر ﷺ ئەفەرموێ (**ألاحسان أن تعبد الله كأنك تراه**) الاحسان، چلەپۆپەی تەقوایە ، الاحسان واتە خوای گەورە بپەرستی کە ئەنەما خوا

دەبینی ، توخوا کەسێك خوا بیبینی شەرم ناکا، حەیا ناکا لـەخۆی ؟ واللەهی یەك قسەی ناشرینی لە دەم نایەتە دەرێ .. کورە بابە ئێمـە لەگەڵ پیاوێکی ماقوڵ بگـەرێین، خۆمـان بەئـەدەب دەکـەین، حـەتا حیسابی هەنگاوەکانی رۆیشتنمان دەکەین ، دەڵـێین باهـەنگاوەکانمان گەورە ناوێین، نەوەك عـەیبمان لـێ بگـرێ، چـیە ؟ واللـە کابرایـەك لەگەڵمان دەڕوا، قسەی ناشـرین ناکـەین، بەئـەدەب دەرۆیـن، قـاتی خاوێن لەبەر دەکەین پێڵاومان دەسڕینەوە چیە ؟ عەیبمان لێنەگرێ ، باشە ئەو زاتە پاکە کە "الله" یە خۆ دەمانبینی، ئینسان چۆن دەبـێ ئاگای لە خۆی نەبێ. دووەم: شت کەئینسان فێـرە تـەقوا دەکـاتن و ئەیکاتە موتەقی ئەوەیە موراقەبەی خوای گـەورە دائیمـەن وەی لـێ دەکاشەرمی لێ بکا، سێیەمین : شت تۆ بزانی بـە چ تووشـی گونـاه دەبی ، رێیەکانی گونـاه بناسـی و خـۆتی لێ بپـارێزی ،چـوارەمین : بەسەر ئارەزووەکانی خۆت زاڵ بی ، ئارەزوەکان ونەفس وهەوات بزانی چـۆن بـە سـەریان دا زاڵ دەبـی ، کوغەڵەبـەیان لەسـەر دەکـەی ، پێنجەمین : رێگایەکانی شەیتان بناسی، شـەیتان بـەچ زەفـەرت پـێ دەبا ، هەتا پێشی بگری، واللەی ابن القيم الجوزی ـ رەحمـەتی خـوای لێبێ ـ قسەیەکی زۆر سەیر دەکا، دەفەرموێ : شەیتان جار وایـە دوو چاکەت پێدەکا، بەڵام سـێیەمیان بـۆ خراپەیـەکی سەرهەڵدەکێـشی، تەماشا دوو چاکەت پێدەکا تۆ دەزانی چـاکەیە، بـەڵام سـێیەمینیان

خراپەیەکی زۆر زۆر گەورەشت پێدەکا ، بەخۆشت نازانی، ئەوها فێـل زانە ، کاکە جارەکی تریش گوتوومە ئەگەر بەرێوەبـەری فەرمانگـە، پەنجا سالە لە فەرمانگەیەك، واللەی نهێنیـەکانی ئـەو فەرمانگەیـە هەموو دەزانێت، هەتا دەزانی دەروونی فەرمانبەران چۆنە، چۆن نییـە چـۆن دەرواو چـۆن نـاروا)، شەشـەمینیان : فکرکردنـەوە لـە نـازو بەخششەکانی خوای گەورە پێی بەخـشیوی فکریـان لـێ بکەیتـەوە، حەوتەمیان : ئەو کاتانەی خلۆەت زۆر بکەی کەخوای گەورە رەحمـەت و بەزەیی زۆر دەبارێنیتن، بۆ نمونە سێیەم بەشی کۆتایی شەو، پێـشی مەلا بانگدانێ بەکاتژمێرێك ئەو کاتە خوا بـۆ خـۆی بـانگی هـەموو بەندەکانی دەکا ﴿هل من تائب أتوب علیە، هل من مستغفر اغفرلە، هل من سائل حتـی اعطیـە﴾ یـەعنی خـوا بـۆ خـۆی بانگـت دەکـا ،تەماشا کێ هەیـە لـەگوناهباران لێـی خـۆش بـبم ،کـێ هەیـە لـە تەوبەکاران تۆبەکەی گیرا بکەم ، کێیە ؟ ئەوانـەی داوام لێدەکـەن تـا پێیان بدەم، ئەو کاتانە هەستەوە موناجات لەگەڵ خوای گەورە بکـە، بلێ خوایە من هەژارم، من شەرمەزارەکەم. ئەمەوێ لێم خۆشبی. من ئەمەوێ تۆبەم لێ گیرا بکەی. من داوات لێدەکـەم ئـەو شـتانەم پـێ بدەی) هەشتەمین : دانیشتن لەمەجلیسی پیاوچـاکان، ئـەو کەسـانەی پیاو چاکن، زۆر لەگەڵیان دانیشی، فێرە تەقوا ئەبی دەبی بەموتـەقی . نۆیەمینیان : ئەو هۆکارانەی کە ئەبنە مایەی بێ ئاگابوونی دڵـت،

لەخوای گەورە، ئەو هۆكارانە لاببە ، دەیـەمینیان : فكركردنـەوە لـە بوونەوەر، لەدروست كراوی خوا ، یانزەمینیان :بەبیر هێنانـەوەت لـە ئەهلی بەهەشت، لەچ نازو بەخششێك دادەژیـن بـۆ ئـەوەی عیـشق‌و تەماعت بۆ دروست بێ، ئالەو كاتەدا ناچاری تەقوا ئەكـەی، بـۆوەی ئەو نازو بەخششێك، بەهەشـتت لـە دەسـت نەچـێ . جـا انـشاءالله بەپشتیوانی خوای گەورە لـە ئەلقـەی داهـاتوو، باسـی ئـەو خالانـە ئەكەین چۆن ئـەبین بەموتـەقی .. بەئومێـدی ئـەوەی خـوای گـەورە یارمەتیمان بدا بتوانین ئەو هۆكارانـە ئـەو تەداروكانـە رێـك و پێـك بكەین بۆ وەی ببین بەموتەقی ، بۆ ئەوەی جـانیزەی "رب العـالمین " وەربگرین بەئومێـدی ئـەوەی ئـەو رەمەزانـە" انـشاالله " باشـترین رەمەزانە كەئێمە ببین بەموتەقی ، هەروەها خۆمـان بەگـەر كـاروانی موتەقیان بدەین .

أقول قولي هذاوأستغفرالله العظيم لي ولكم ولسائر المسلمين مـن كـل ذنب.. السلام عليكم ورحمة الله وبركاته

# بەشی دووەم

بسم الله الرحمن الرحيم

الحمدلله رب العالمين والـصلاة والـسلام علـى حبيبنـا محمـد وعلـى الـه وصحبه أجمعين ..السلام عليكم ورحمة الله وبركاته

برایانی بەرێزم : میوانانی خۆشەویست، بەراستی مـن بـەوەفاداری ، بەرامبەربە پێغەمبەری خوا دانانێم ، کاتێك مرۆڤ لەمەجلیسێکی وا دانیشیتن بەبێ سەڵاوات ئەم مەجلیسە کۆتایی پێ بێ . بەراستی من بەجەفایی دادەنێم، بـەبێ رەحمـی دادەنـێم، بەرامبـەر بەپێغەمبـەری مرۆڤ. هەست بەکەمو کورِی دەکا، کە لەمەجلیسێکدا بوو سـەڵاواتی لەسەر پێغەمبەری لێ نەدا ، جا بۆ ئـەوەی نوروبەرەکـەتی حـەزرەت حازربێتن، بـۆ وەی خەبـەری ئـەم مەجلیسانە بـۆ پێغەمبـەری خـوا بچێتەوە، لەوێ ستایشمان بکا با هەمووەمان سـێ سـەڵاوات لەسـەر پێغەمبەری لێبدەین ﷺ. برایانی بەرێزم ئێمە لەدەرسی رابردوومانداباسی تەقوامان کرد لەخزمەتی رسـول اللـەی دابـووین ﷺ کاتێـك ئامۆژگاری دوو هاوەڵی بەرێزی دەکـرد پێـی گـوتن ﴿اتـق الله حيـث

ماکنت ﴾ پاشان هاتینە سەر تەقواو پێناسەمان کردو هاتین پرسیارێکمان لەخۆمان کرد گوتمان : باشە ئێمە زۆرجاران گوێمان لێ دەبێ لە ئایەتەکان و لەفەرموودەکانی پێغەمبەری خوا یاخود لەوتەی مامۆستا بەرێزەکان پێمان ئەڵێن : ﴿اتق الله ﴾ لە خوا بترسە . باشە من چبکەم؟ بۆ ئەوەی ببمە موتەقی ؟ ئەمن چبکەم بۆ وەی لە موتەقییان حیساب بکرێم ؟ چبکەم بۆوەی بڵێن ئەو کابرایە تەقوای خوای کردیە ؟ وەڵامەکە ئیمام غەزالی دایەوە- رەزاورەحمەتی خوای لێبی - فەرمووی ئەوکەسەی ئەیەوێ ببێ بەموتەقی . یاخود ئەوکەسەی ئەیەوێ فەرمانەکانی خواوپێغەمبەر جێ بەجێ بکا، کاتێك کەخواو پێغەمبەری خوا فەرمانی پێدەکەن ﴿اتق الله ﴾دەبێ پێنج شتان بپارێزی یەکەمین : چاو، دووەمین : زمان، سێیەمین : گوێ، چوارەمین : دڵ، پێنجەمین : گەدە. گوتمان : ئەو پێنج شتە بپارێزی، ئینجا ئەو مرۆڤ ئەتوانی تەقوای خوای بکاتن بەچاکی، ئینجا دێتە ناوموتەقیان و بەگەر کاروانی موتەقیان دەکەوێتن ، ئینجا ئەوهەموو سوودەی تەقوای خوای گەورە هەیتی، ئەوەی بەدەست دەکەوێتن یاخود ئەوهەموو بەخشش و ماندوبوونو دیاریە سامانەی کەخوای گەورە داینـاون بۆ مرۆڤی موتەقی، ئەو کاتە وەریدەگرێ، بەڵام پرسیارێکی تر دێتە پێش، باشە من چیبکەم بۆ وەی بتوانم ئەم پێنج ئەندامە لەگوناه بپارێزم؟ من چیبکەم بۆ وەی

باوەڕێکی وام بۆ دروست ببێ بۆ وەی بتـوانم پارێزگـاری چـاوو زمـان وگوێ و دڵو گـەدەی خـۆم بکـەم، تووشـی هـیچ گونـاهیکی نـەبم. لەبەرئەوەی ئەو پێنجانە مەرجن، هەر کەسێك ئـەم پێنجـە بپـارێزێ ئەوا فیراسەتی بۆ دروست ئەبێ، هەر وەکو لەوانەی رابردوو گوتمـان . نـەك ئەوەنـدەش، بـەڵکو ئەگـەر زۆر هەوڵبـداتن، ئـەگات بەپلـەی ولیایەتی ونەبێ بە وەلیەك لە وەلیەکانی خوای گەورە . جا بۆ ئەوەی ئێمە بتوانین بەچاکی ئەم ئەندامانە بپارێزین، چەند خاڵێك دەبێ جـێ بەجێ بکەین، یەکەمین : خۆشەویستی خوای گەورە، واتە: دەبێ مرۆڤ خۆشەویستی خوای گەورە لەدڵو دەروونی برووینێ . دووەم :شت دەبێ بزانێ چاودێرێك لەسەرسەرت هەیـە ﴿ان الله کان علـیکم رقیبـا ﴾ (النساء :١) دەبێ بزانی وا بۆخۆت حیساب بکەی، کەهەموو شـتێك ئەتۆ بیکەی خوای گـەورە ئـەیزانێ ﴿وهـو معکـم أیـن مـاکنتم ﴾ (الحدید: ٤) خوای گەورە ئەفـەرمووێ : لەهـەر شـوێنێك بـن خـوای گەورە لەگەڵ ئێوەیەو ئەتان بینێتن، جـا باسـی ئـەو چـاودێریەش ش ئەکەین بزانین چۆن دروست ئەبێ . سێیەمین : بزانی هەرکاتێك گوناه دەکەی، چ دەقەومێتن چ خەجاڵەتیەك چ روو رەشیەك چ ماڵ کاوڵیەك دەقـەومێتن، جـا چ بەرامبـەر تـاك چ بەرامبەرکۆمـەڵ وخـەڵکی. چوارەمینیان : بزانین (مەکری) شـەیتان چـین رێ وئـەو کـۆڵان وئـەو شـەقامانە کـە شـەیتان دێ ئێمـە پـێ هەڵدەخەڵـەتێنی، ئـەتوانی

زەفەرمان پێ ببا، ئەوانە چین، بۆ وەی پێشی لێ بگرین ونێلین شەیتان زەفەرمان پێ ببا . **پێنچەمین** : چۆن شەڕی دەروون وهەوای خۆت دەكەی وبەسەری زال دەبی . جاری یەكەمینیان لەگەڵ "محبة اللة" خۆشەویستنی خوای، روحە لەبۆ هەموو كردەوەكانمان، هەركەسێك كاتێك ئیشەكی باش دەكا، ئەگەر بێتوو بەتیەتی خۆشەویستی نەیكا، ئەوئیشە روحی پێوە نیە ومردیە، بەڵكو هەركەسێك ئەگەر خۆشەویستی خوای گەورەی لەدڵدا نەبێ، بۆ خۆی مردووە چ جای كردەوەكانی، خۆشەویستی خوای گەورە نورە، هەركەسێك نەیبێ لەزوڵمەتدا دەژیێ. خۆشەویستی خوای گەورە شیفایە، هەركەسێك نەیبێ نەخۆشەو لەنەزیەت ونەشكەنجەدا دەژی. بەڵكو خۆشەویستی خوای گەورە بنچینەی باوەڕە، رۆژێكیان یەك لەهاوەڵەكانی پێغەمبەری خوای (ﷺ) هاتەخزمەتی پێغەمبەری، فەرمووی : ﴿یارسول الله ما الایمان﴾ باوەڕ چیە ؟ بزانە پێغەمبەر فەرمووی : ﴿**الایمان أن یكون الله ورسوله أحب الیه مما سواهما** ﴾ باوەڕ ئەوەیە خواو پێغەمبەرت لەهەمووكەسێكی زیاتر خۆش بوێ، ئەوە باوەڕە، دەی كەواتە ئێمە دەمانەوێ پەیوەندی لەگەڵ خوا ببەستین، ئەو پەیوەندی بەندە لەگەڵ خوای نەبەستێ، ئەگەر بێتوو لەمونتەڵەقی خۆشەویستی نەبێ، تام ولەزەت لەو باوەڕەی ناكا، خۆشی لەزەتو شیرناتی لەبەندایەتیەكانیشی ناكا، بەندایەتی خوای گەورە نەكا.

خۆشەویستی خوای بنچینەیە، بۆیە خوای گەورە لەقورئاندا، لەچەند شوێنێکدا باسی کەسانێك دەکا، ئەوکەسانە خواش خۆشیانی دەوێ، ئەوانیش خوای گەورە یان خۆش دەوێ. خوای گەورە لەو ئایەتە ئەفەرمووێت ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ مَن يَرْتَدَّ مِنكُمْ عَن دِينِهِ فَسَوْفَ يَأْتِي اللَّهُ بِقَوْمٍ يُحِبُّهُمْ وَيُحِبُّونَهُ ﴾ المائدە /٥٤ واتە: ئەی کۆمەڵەی باوەڕداران هەرکەسێك لەئێوە ئەگەر بێتوو پشت لەخوای بکا واز لەئایینی خوای بینی، خوای گەورە منەتی بەوەی نیە، کۆمەڵێك دێنێ تاقمێك دێنێ یەکەم خاسیەتی ئەوکۆمەڵ وتاقمە ئەوەیە خوایان خۆشدەوێ، خواش ئەوانی خۆش دەوێ،کەواتە تەماشا یەکەم خاسیەتی ئەو تاقمە پێش ئەوەی خوای گەورە بڵێ بەندایەتی زۆر دەکەن، پێش ئەوەی خوای گەورە بڵێ ئەوانە ئازاوبەغیرەتن بۆ دینی خوا، شەونوێژی زۆردەکەن، هەتیمو هەژاران بەخێو دەکەن هیچی نەگوت، یەکەم شت ﴿يحبونهم ويحبونه ﴾ یەکەم خاسیەتیان ئەوەیە خوایان خۆشدەوی، خوای گەورەش ئەوانی خۆشدەوێ، لەئایەتەکی تریش دەفەرمووێت : ﴿ومن الناس مَن يَتَّخِذُ مِن دُونِ اللّهِ أَندَاداً يُحِبُّونَهُمْ كَحُبِّ اللّهِ وَالَّذِينَ آمَنُواْ أَشَدُّ حُبّاً لِّلّهِ﴾ البقره/ ١٦٥. ئەفەرمووێ : هەندێ کەس هەنە لەخەڵکی بت وسەنەم ئەکەنە خوای خۆیان، زۆریان خۆشدەوێن خوای گەورە ئەفەرمووێ :﴿ وَالَّذِينَ آمَنُواْ أَشَدُّ حُبّاً لِّلّهِ﴾ بەلام نەخێر وانیە، ئەوکەسەی باوەڕدارە

لەهەمووخــەڵكى زيــاتر خــواى خۆيــان خۆشــدەوێ، جــا بەراســتى خۆشەويــستى خــواى بنــچينەيە، كــە مــرۆڤ بتــوانى تــام ولــەزەت لەبەندايــەتى خــۆى بكــا لەنوێــژەكانى، لەرۆژيــەكانى لــەزيكرەكانى لەهاموشۆى بــرادەرى چــاك، لەمەجليــسى پياوچــاكان لەمەجليــسى زانست و زانيارى ئەگەر بتەوێ تامى لىێ بكەى، يەكەم مەرج ئەوەيــە بەينى خــۆت وخــوا خۆشەويــستيەك دروســت بكــەى، خــواى گــەورە لەقورئاندا يەكەم ئايەت كە دەستى پێ كرد﴿بسم الله الرحمن الرحيم﴾ لەسورەتى فاتيحە، ئايەتە . باشە لۆ ﴿بــسم اللــه الــرحمن الــرحيم ﴾ چونكە ئەوكەسەى كە دێ بەرەو خواى جاران، پشتى لەخواى كرديــە، شتى واى كرديە كەخواى گەورە ليێى تورە بووە، ئێــستا ئەگــەر بێــت وبەرەوخوا بێ دەبێ خواى گەورە بە ناوێكى وا خۆى پيــشاندا يەكــەم خۆشەويستى وعەشق و خۆشەويستى خواى گەورەى لە دڵ دروست بى خواى گەورە نەيفەرموو: ﴿بسم الله العزيز الجبار ﴾ بۆ..؟ ئەو ناوانە بە ترسن مرۆڤ ناوێرێ خۆيان لەبەر رابگرێ، بــەڵام خــواى گــەورە دوو ناوى خۆى هێنا، ئەو دوو ناوە هەردووك بەڵگەن لەسەر خۆشەويستى دەكەن ﴿بسم الله الرحمن الرحيم ﴾ ئەو بەندە كاتێــك دێتــە خزمــەت قورئان دەيەوێ ئاشنا ببێتەوە لەگەڵ خوا دەيەوێتن ئاشتەوايى لەگــەڵ خوا، بكا . دەبينى دوو دەرگــەى لــێ كراوەتــەوە لــەدوو نــاوى خــوا ﴿الرحمن ﴾ ﴿الرحيم ﴾ الرحمن .ئەوكەســەيە كــە بــەزەيى بــە هــەموو

خەڵك دەكا بێ باوەڕو موسڵمان ﴿الرحيم﴾ ئەو خوایەیە كە بەس لە ڕۆژی دوایی بەزەیی بەموسڵمانان دەكا. ئەوكەسەی داوای لێخۆشبوونی لێدەكا، لەوكاتەدا لەخوا دەچێتە پێش بەخۆشەویستی ئینجا لێی نزیك ئەبێتەوەو ئاشتەوایی لەگەڵ ئەكا، جارێكیان هاوەڵێكی پێغەمبەر (ﷺ)كە دەشتەكیەك بوو، هاتە خزمەتی گوتی: ﴿متى الساعة﴾ ئەی پێغەمبەری خوا كەی ڕۆژی دواییە ؟، پێغەمبەر فەرمووی: چیت بۆ ڕۆژی دوایی ئامادە كردوە، ئاوا لە ڕۆژی زیندبوونەوە دەپرسی .؟ گوتی : واللەهی هیچم بۆ ئامادە نەكردیە بلێی ڕۆژیم زۆر گرتبێ، یاخود شەونوێژم زۆركردبێ ویاخود خێروخێراتم زۆركردبێ، بەس خۆشەویستی خواو پێغەمبەری خوام بۆ ئامادە كردیە هەر ئەو دووە .. پێغەمبەر فەرمووی : ﴿المرء مع من أحب﴾ ﴿يحشر المرء مع من أحب﴾ فەرمووی: كێت خۆش بوێ ڕۆژی دوایش حەشریشت لەگەڵ وییە . ئەنەسی كوری مالیك یەك لەهاوەڵەكانی پێغەمبەرە ئەفەرمووێ : واللەهی كەیفمان بە هیچ نەهات، ئەوەندەی كەیفمان بەم قسەی پێغەمبەری دێتن، ئینجا ئەنەس دەیفەرموو : من خواو پێغەمبەری خواو أبوبكرو عومەرو عوسمان و عەلیم خۆش دەوێ بۆ ئەوەی لە ڕۆژی دوایی حەشرم لەگەڵ ئەو پیاو چاكانە بێ، حەشرم لەگەڵ ئەو چوار خەلیفەیە بێ، حەشرم لەگەڵ ئەو " العشرة المبشرة " بێ، ئێوەش لە ئێستاوە شەپۆلی دڵی

خۆتان باوێنه سەر خواو پێغەمبەری خواو أبوبکرو عومەرو عوسمان وعەلی وهەموو هاوەڵەکان وتابعین وپیاو چاکەکان. ئاگاتان لە دڵی خۆتان بی کردەوەی دڵت زۆر گەورەیە . واللەی ئەوەندی دڵ خوا ئەناسێ و بەندایەتی خوا ئەکا، ئەوەندە ئەندامەکانی بەندایەتی ناکا، ئەوەندە تووشی تەمبەڵی و ریبا دێ ، دڵ زۆر زۆر بێ ئەرك دەتوانی بەندایەتی خوای گەورە بکاتن ، رۆژێك کابرایەك لای سەلمانی فارسی میوان ئەبێ . چاودێری سەلمانی دەکا ، دەڵێ بزانم ئەوە چ دەکا ئەو هاوەڵەی کە پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرمووێ :" سلمان منا من أهل البیت " بزانم ئەوە چ دەکا دەبی ئەوە سەری لەکرنۆش هەڵنە گری؟ بەردەوام بەرۆژی بی؟ بەردەوام خێرو خێرات بکاتن؟! دیتی سەلمان زۆر ئاساییە، هەتا بەیانی نوست .. پێی سەیر بوو بەیانی گوتی: سەلمان من زۆرم پێ سەیرە ئەمن وامزانی ئەتوو نانوی، هەر شەونوێژ دەکەی ، سەلمان گوتی: بۆ شەوێ هیچ مینگە مینگی منت گوێ لێ نەبوو ، گوتی :بەرێ واللە. گوتی :چیم دەگوت ؟ گوتی:هەرکاتێك هەڵدەستای تەنیشتی خۆت وەردەگێرا دەتگوت: ﴿سبحان اللە والحمدللە ولاالە الاالله والله أكبر﴾ گوتی:ئەوە شەونوێژی منە.کاکە ئەوا بەدڵ پەیوەندی لەگەڵ خوای گەورە، کردیە راستەوخۆ، بەلام بەدڵ زۆر ئاگای لە "رب العالمین " ە، برام کردەوەی دڵ زۆر گرینگە. بۆیە شەیتان هەموو ئامانجی ئەوەیە، دڵت داگیربکا،رۆژێك ئەهات شەیتان

دەستەکمان داگیربکات، قاچمان داگیربکات .دڵت داگیر دەکات، چونکە ئەگەر دڵت کاوڵ بوو ئەندامەکانت کاوڵ دەبێتن . جا بابزانین ئێستا بۆخوامان خۆشدەوێ.؟ تەماشاکە مرۆڤ بۆیە خۆی خۆشدەوێ چونکە لەژیاندایەو ئەژێت، زۆر خۆی دەپارێزی، پارێزگاری خۆی دەکا لەشەڕ، لەگوللەی، لەکارەساتی، لە نەخۆشی چارەسەری خۆی دەکا، .هەرخۆشەویستی خۆتە ئەچیتە دکتۆری وسەد، دوو سەد دیناری لەخۆت دەدەی و حەبی دەخۆی هەر لەبەر خۆشەویستی خۆتە کابرای شەکرەیتی خۆشترین خواردن وبەلەزەت ترین خواردنی لێ مەحرومە، لەبەرئەوەی تەندروستی خۆی ئەپارێزێ .لەبەرئەوەی خۆشەویستی زاتی خۆی لە دڵە. باشە ئەگەر دەزانی زاتی خۆت و ژیانی خۆت بەدەستی خوایە.دەبێ خۆشەویستی راستەقینە لە بۆ "رب العالمین "بێ، تۆ ئەوەندە پابەندی لەسەرخۆت و ژیانت وانیە.؟ خۆئێمە دەزانین ژیانمان ومردنمان بەدەستی خوایە. دەی کەواتە دەبی خۆشەویستی راستەقینە خۆشەویستی راستی بۆ "رب العالمین " بێ، چونکە ژیانت بەدەست ئەوە، تەندروستیت بەدەست ئەوە مان ومردنت بەدەست ئەوە ، دەی کەواتە هۆکاری یەکەم : کە ئێمە خوامان خۆشدەوێ، چونکە ژیانی ئێمەی بەدەستە، دووەم: شت خوای گەورە نازو بەخششی گەلێك زۆري لەگەڵ بەندەی کردیە ﴿**وان تعدوا نعمة الله لاتحصوها**﴾ (ابراهیم: ٣٤) ئەگەر بێت و بەخششەکانی خوا

لەسەرخۆت بژمێری هەرگیز پێت ناژمێرێ، مرۆڤیش﴿عبد ألاحسان﴾ هەردەم ئەگەر یەك چاکەی لەگەڵ کردی تەماشابکە، ئەگەرکابرایەك هەزار دیناری بداتە یەکێکی واللەی لەدوور ڕا دەستی بۆبڵند دەکات، لەمەجەلیسان جێی بۆ دەکاتەوە، لەجێیان پێدا هەڵدەڵێ . نازانی چۆن تەعبیر لە خۆشەویستی و ڕێزوتەقدیری خۆی دەربڕی واللە چیە.؟ هەزار دیناری دایتێ .باشە ئەتوو تەماشای خۆت ناکەی، هەر هەموو لەشت بای مەلاین مەلاین دۆلارە هی خوایە . ئەگەر چاوێکمان پێوە نەبێت، خوانە نەخواستە ئەگەر هەردوو چاومان پێوە نەبێ، بۆ ئەوەی بچین چاوێکی بکڕین، چەندی پارە لێدەدەین، بەس بڵێین دکتۆرێك لەلەندەن پەیدا بووە ئەو دکتۆرە کوێران چاك دەکاتەوە، واللەی ئەوکابرایە دەرگا دەرگا سواڵ دەکاتن، بەس بچێتن چاوەکی چاك بکاتەوە .باشە گوێت بای چەندییە.؟ ئەی دەمت بای چەندییە.؟ ئەی دەستت بای چەندییە.؟ ئەی قاچت بای چەندییە.؟باشە حیسابی هەموو ئەندامی خۆت ناکەی بای چەندییە.؟ خۆخوای گەورە یەك فلسی نە لەبابت نەلە دایکت نەلەعەشیرەتت نەلەتوو وەرنەگرتیە.ئەو هەموو نازو بەخششە دایتیە تۆ، ئەدی ئەو عەقڵەت؟ باشە ئێمەو ئەوشێتانەی لەسەر ئەو شەقامە کە وتوونە!، تەماشای خۆت بکە، خاوێن وباوێن ڕێك وپێك، وا شێتیش لەنەخۆشخانەی دەروونین، بزانە چ جیاوازیەکمان هەیە ئەمن وئەو چ

جیاوازیەکمان هەیە، ئەو لەمن بەهێزترە، ئەولە من گەورە ترە، ئەو لەمن بەتێنترە بەس عەقلی نیە. من عەقلم هەیە،دەی کەواتە تۆو ئەو کەسەی، ئەوکە منداڵ بەدوای دەکەون وپیس و پۆخڵە، تۆش کەکەس بەدووات ناکەون وخاوێن وباوێنی جیاوازیەکەتان عەقڵە.. دەی ئەدی ئەوە گەورەترین نیعمەتی خوا نیە بۆ ئێمە، لەنیعمەتان گەورەتر بەخششمان باوەڕ ئەو کەسانەی گای دەپەرستن، ئەوکەسانەی ماددەی دەپەرستن، ئەوکەسەی کڕنۆش بۆ چێڵێ ئەبا. ئەوکەسانەی ڕیخ بە نیوچەوانی خۆیانەوە دەنێن، لەگەڵ ئێمە چ فەرقی هەیە.؟ نیە. بۆ ئەو وادەکا، من وا ناکەم من بەخششی باوەڕم پێ بەخشراوە، ئەوهێشتا ئەو بەخششەی پێ نەبەخشراوە ، ئەوهەموو بەخششە، ئەی باشە ئەوهەموو بەخششانە ئی خوای نیە.؟ ئەوهەموو نازونیعمەتە نی"رب العالمين " نیە.؟ باشە بۆ تەماشای خۆمان و گیانەوەر ناکەین ، تۆ لەسەر دوو قاچی جوان دەڕۆی، هەتا ئەگەر شتێك بخۆیت، دەستت دێنیت بۆ دەمت لەبەرەوەی تۆ عەزیزیت ﴿ولقدكرمنابني ادم ﴾ الاسراء:٧٠ ئەو مرۆڤە سەرشۆرناکات لەبۆخواردن، بەڵکو خواردنەکە بۆدەمی دەبات، باشە گیانەوەر خۆ زۆر لە ئێمە بەهێزترن، ئینجا سەرشۆر دەکاتەوە بۆ خواردن، تەماشا ئەوە گەورەترین نیعمەت نیە کە تۆ وەکو ئاژەڵ نی.؟ کە تۆ مرۆڤێکی ڕێك وپێکی، دەزانی چ دەبی چ نابی چۆن دەبی .؟ بەلآم

یەك نهێنی سەرسورهێنەر، سەعیدی نەورسی لـەكتێبێكی بـەناوی " قطوف من ازاهيرالنور "سـبحان اللـە یـەك نهێنـی زۆر سـەیر بـاس دەكات، ئێستا بەبیرم هاتەوە باسی نزا دەكا دەفەرمووێ : نهێنی نزا لەمەدایە . ئەفەرمووێ : مرۆڤ و ئاژەڵ، وەكـو یـەك نـەبن ئاسـاییە زاوزێ لەنێوان ژن ومێرد رووئەدا، لای ئاژەڵیش زاوزێ هەیە، دوایـی سك پڕ دەبی، هەردوو سـكەكە ئاسـاییە وانیـە.؟ ئاژەڵەكـە لـەدوای لەدایك بوون، بەدووسێ مانگ هەموو شـتێك فێـر دەبـی . هـەموو شتێك، ئەو شتەی كە پێویستییە بۆ ئەوئاژەڵە هەمووی فێـر دەبـی، خواردنی چۆن دەخوا چۆن رادەكات، چۆن خۆی دەپارێزی لـەدوژمنی خۆی ، عەشیرەتی خۆی كێیە.؟ هەمووی دەناسێت بەدووسێ مانگان، دایكی دەناسی باوكی برای خوشكی، خزمـی كـەس وكـاری، ناوچـە هەمووی شارەزا دەبی ، بەلاّم مرۆڤ وانیە، مرۆڤ تەمـەنی دەگاتـە دە ساڵی، ئەوجا دەزانی ئەوە مامیتی ئەوە خـاڵیتی، وعـومری دەگاتـە چل ساڵی ئینجا لەنهێنی ژیان و لـە نهێنیـەكانی لـە هـەموو كـەون وبونەوەرو دەوراو پشتی خۆی تێدەگا، لەبەرچی.؟ بۆ ئەوەی بزانێ ئەو مرۆڤە، تۆ پێویستی ئەی مرۆڤ تۆ وەكو ئاژەڵ نیـی، تـۆ لـەقۆناغی یەكەمی ژیانت كە بەرەو ژیان ئـەڕۆیت، هـەمووكات هـەر پێویـست بەخوای، هەتا ئەو ڕۆژەی دەمریت، هەر پێویستت بەخوا نییە؟ وەكـو ئاژەڵ نەبووی هەر پێویستت بە خوایە، هەرچـەندە بـڕوا موحتـاجی

خواین ،هەرچەندە بژین موحتاجی خواین، ئـالێرەدا ئـەبێ پەیوەنـدی لەگەڵ ئەوخوایە بەنزا بکەین ، نزا یەك لەکلیلەکانی خۆشەویـستیە، ئەوکەسەی کەوا خۆشەویستی لە دڵ دابێ، دەقەیەك ناتوانی بەبێ نزا بژیێ، هەردەم نێوان خۆی و نێوان خوای خۆی پەیوەندی پێ ئـەکاتن، انشاالله لە لەکۆتایی باسی ئەکەین، یەك لەو شـتانەی خۆشەویـستی زیاد ئەکا، دەبێ ئەومرۆڤە دانیمەن زیکری خوای گەورە بکاتن. جـا برایانی بەڕێزم ..دووەمین هۆکار کە ئێمـە بۆیـەخوامان خۆشـدەوێ، لەبەرئەوەی خوای گەورە نازو بەخشـشی گەلـەك بەئێمـە بەخـشیوە. سێیەمین : هۆکار: خوای گـەورە لەبـەر ئـەودی خاسـیەتی جـەمالی هەیە . عادەتی مرۆڤ وایە شتی جوانی خۆشدەوێ، بەهارت خۆشدەوێ ،ئافرەتی جوانت خۆشدەوێ ، میوەجاتی جوانت خۆشـدەوێ ، دیـەنی سروشتی جوانت خۆشدەوێ ، ئاوەك شەلالەك دێتە خوارێ سەوزیەکت لەبنە، ئەو هەمووە گوڵی جوانی زەردو سۆرە وا شین بووە، بەسروشتی خـۆت هـەوات بـۆ هەڵدەسـتیو خۆشەویـستی ئـەو جێیـەت لـەدڵ دەنیشێت، هەتا ئەگەر لەتەلەفزیۆنی جێیەکی خـۆش پیـشان بـداتن، ئەك بۆخۆت ببینی، ئیـشتیای ئەوجێیـەت لەبۆهەڵدەسـتێتن ،باشـە وەدیهێنراوەکەی ئەوەندە جوان بی، ئەدی دەبی وەدیهێنەر چەند جوان بێ ،دەبێ وەدیهێنەر بەخۆی چەند جـەمالی هـەبێتن ، جـا بۆیـەدەبێ ئێمـە خۆشەویـستی وخۆشەویـستیمان بـۆ خوامـان لـەدڵ دابـێ،

لەبەرئـــەوەی خاســـیەتی جـــەمالی هەیـــە، گەلـــەك گەلـــەك جوانـــە ،لەبەرهۆیەكی تر ئێمە خوامان خۆشدەوێ، لەبەر زاتی پاكی وبـەس، لەبەر زاتی پاكی "الله " موستەحەقی خۆشەویـستی وموسـتەحەقی بەندایەتیە، موستەحەقی خۆشەویستی وموستەحەقی ئەوەیەكە مـرۆڤ بەرامبەر بەخوا زەلیل بێ، ئەوەش بەندایەتییە، ڕوحی بەندایەتیە واتا نهێنی بەندایەتی ئەوەیەكە ئەو پەڕی ملكەچی‌و زەلیلـی لەگـەڵ ئـەو پەڕی خۆشەویستی بۆ رب العالمین، ئەوە لەو پـەڕی تاعـەت دا.. جـا برایانی بەڕێزم.. كاتێك ئاوا بوو، بەوخۆشەویـستیەوە بـەو شـتانەی گوتمان:خۆشەویستی خوای لە دڵی نیشت ئەو كاتە دڵی منەوەر ئـەبێ . ئەوكاتە عیبادەتی خوای ئەكا، نە لەترسی جەهەنەم نەلەبەرخۆشـی بەهەشتیش .نەء.بەس لەبەر زاتی " الله " یە لەبەرجەمالی " اللـە " یە، بەندایەتی ئەوخوایە ئەكاو هیـچیتر نـا.. گوتیانـە : ڕابیعـەی عەدەویە ﴿ماحقیقة ایمانك ﴾ ڕاستەقینەی باوەڕی تۆ چیە .؟ وتـی: واللەی من بەندایەتی خـوا ناكـەم بـۆ ئـەوەی نەمباتـە جەهنـەمێ، بەندایەتی خوا ناكەم بۆ ئەوەی بەهەشـتم بـداتێ، ئەگـەر وەبـی مـن كرێكارم ، خوای گەورە ئەفەرمووێ : بەندایەتی بكە منیش بەرامبەر ئەو بەندایەتیە دەتبەمـە بەهەشـتێ، وەكـو عەمەلـەكی خـۆم دێتـە بەرچاوی ، بەلاّم من بەندایەتی ئەو خوایـە دەكـەم، چـونكە موسـتە حەقی پەرستنە ﴿حبا لە و شـوقا الیـە﴾ بەڕاسـتی ئەوانـە تامییـان

لەباوەڕ کردیە، ئەوانە لەزەتی و بەندایەتی وخواناسییان چەشتیە .. جابۆیە، یەك لەپیاوە چاکەکان دەیفەرموو:﴿ مساكين أهل الدنيا ﴾ دەیگوت : بەڕاستی خەڵکی دونیا زۆر غەریبو هەژارن، کە لەدونیا چوونە دەرێ خۆشترین لەزەت ناسینی خوا بوو نەیان چێشت، "سبحان الله" ئەگەرمرۆڤێك لەدونیا ژیاو مرد وخۆشەویستی خوای گەورەی نەچێشت ئەوا مەحرومە ، ئەوا زۆر بەغەریبی مردووە، چونکە ژیان هەمووی ئەشکەنجەیە، هەمووی ئازارە، هەمووی غەمە، هەمووی دڵتەنگیە هەمووی خەفەتە، هەمووی ماندوو بوونە ((لقدخلقنا الانسان فی کبد)) هەرهەمووی ماندی بوونە، بەڵام ئەوەی تەعویزی ئەوهەموو غەم وئەزیەت وئازارەی دەکاتەوە چیە.؟ خۆشەویستی خوایە ، با نموونەیەك بینمەوە گریمان کورە گەنجێك لەکونێکی بچکۆلانە، تەماشای خۆشەویستەکەی خۆی بکا، لەوکاتە بن پێی هەرهەموو مێروو لە ونەو شتانە پێیەوە بدا، بڕوا بکە گوێی لە ئازارەکەی نیە .. بەس بۆ ئەوەی چاوی لەسەر خۆشەویستەکەی خۆی لانەدات ، دانیمەن پێی دەکوتێ، ئەزیەت دەخوا، وا هەموو شت پێیەوەی ئەدەن میرو لێوە ئالایە، هیچ گوێ ناداتە ئەو ئەزیەت وئازارەی لەبەرچی.؟ لەبەرەوەی خۆشی ولەزەتی تەماشاکردنی خۆشەویستەکەی ئەو ئەزیەت وئازارەناهێڵێت، ..ئێمەش دەبی وا بین ئەو خۆشەویستیەی لەنێوان ئێمەو خوا هەیە ئەو ئەزیەت وئازارەش،

کە ئێمە دەبینین دەبێ ئەو خۆشەویستیە غالب بێ لەسەر ئەزیەت وئازارەکانمان، تەماشاکە یەك لە پیاو چاکەکان : ناوی عەلی کوری مۆفەقە . دەفەرموێ : لەخەودا بینیم وامزانی ئەمنیان بردە بەهەشتێ، تەماشاکەن ئەوە ئەهێنیەکەیە گوتی : چووم لە پێش دەرگەی پیاوێکم دیت ڕاوەستا بوو، پیاوێکی منەوەر هەندێ کەسی رێ دەدا، هەندێ کەسی دەگەڕاندەوە نەیدەهێشت بچنە ناو بەهەشتێ گوتی : ئەوجارە چووم دیتم زەلامەك دانیشتیە دوو فریشتەش پارووی بۆ دەکەن، خۆشترین خواردن دەخوا .گوتی : ئەوجارە چوومە ئەو لای، گەیشتمە عەرشی خوای گەورە دیتم کابرایەك ئاوا تەماشای خوا دەکات، ئەچاو دەنوقێنی ئەسەر دێنێتە خوارێ گوتی : ئەمنیش بە ڕەضوانی بەهەشتم گوت : گەورەی فریشتەی بەهەشتێ یە، گوتم: ئەوە کێیە .؟ گوتی ئەوا مەعروفی کەرخییە .گوتم : ئێ باشە ئەوا چۆن ئەو پلەی وەرگرتیە گوتی : واللەی لەبەرئەوەی بەندایەتی خوای دەکرد، نە لەترسی دۆزەخ نە لەخۆشی بەهەشتێ، بەس لەبەرخۆشەویستی خوای گەورە عیبادەتی دەکرد . بۆیە خوا ئەو پلەی پێدا ..ئەبوسولێمان یەك لەپیاوچاکەکانە ئەفەرموێ: هەرکەسێك لە دونیا بەخۆی سەرقاڵ بی، لەرۆژی دوایی هەر بەخۆی سەرقاڵە . لەدونیا هەرکەسێك بەخوا سەرقاڵ بێ، لەرۆژی دوایش هەر بەخوای خۆی سەرقاڵە . بەخۆت سەرقاڵ، بەماڵ ومنداڵ وهەموو غەمت

بینەو بەردەو نیتم وبەشم ناکا، رۆژی دوایش هەروا حیساب وکتابی بینەو بەردەت لەگەڵ دەکەن ، بەڵام ئەگەر بەخوای خۆت سەرقاڵ بی، هەم دونیاکەشت لەبۆ دەستەبەر دەبی، هەم لەرۆژی دوایش تەنها بەخوای خۆت سەرقاڵ دەبی، بائەوەندەش باس بکەین پاداشتی ئەوکەسانەی خۆشەویستی خوایان هەیەو بەندایەتی خوای دەکەن، بەس لەبەرخۆشەویستی وی، کاتێک کە سوجدەی لۆ دەبەن یان فەرمانێکی خوای جێ بەجێ دەکەن، تەنها لەبەر خۆشەویستی خوا، ئەنجامەکەشی رۆژی زیندوو بوونەوە، ئەوە نیە بیانباتە بەهەشتێ وبەس نەخێر .. بەڵکو پاداشتی ئەوەیە خوای گەورە ببینن، ابراهیمی کوری ئەدهەم ـ رەزای خوای لێبی ـ یەك لەئەولیاکانە گوتی : ئەوەندە عەشقی خوام لە دڵدا بوو، ئەوەندە خۆشەویستی خوام لەدڵ دابوو، دەمگوت : خوایە دەبی جێگیری دڵم پێ بدەیت.گوتی : دەستم بڵند کرد بوو دەمگوت: خوایە ئەگەر شتێك چارەسەرێك هەیە بۆ ئەوەی دڵم جێگیرو بکەوێتە ناو و دڵم ڕابوەستێ، خوایە ئەگەر لەپێشە من دایتە کەسێکی تر بیدە من، گوتی :ئەو نزایەم دەکرد شەوێ خوای گەورەم لەخەوێدا دیت.. خوای گەورە پێی گوتم : توخوا ابراهیم تۆ شەرم ناکەی ئەو نزایە دەکەی؟، ئەتوو هێشتا نەگەیشتیە من، تۆ دەتەوێ دڵت جێگیر ببی و شەوقت لە بۆ من کەم ببێتەوە؟ گوتی: ئەو دوعایە نەکەی ، بەڵکو هەتا نەگەییە من دڵت ڕۆژێك لەرۆژان

هەتا لەدونیا مابی جێگیر نابی ، بۆیە دەبێ ئێوە هەردەم شەوقتان هەبی بۆ من ، لەبەرهەمەکانی خۆشویستنی خودای گەورە. یەکەم : دیتنی خوای گەورە . کە خۆشترین لەزەتە لەناو هەموو لەزەتەکانی بەهەشتدا. دووەم : ئەوانەی خۆشەویستی خوایان هەیە، شەوقی بۆ خوای پەیدا دەبێ، هەردەم شەوقی ئەوەیە کەبەزووترین کات بەخزمەت خوای گەورە بگات ، باشە بائێستا بزانین نیشانەکانی چیە؟. بۆ ئەوەی بزانم من خوام خۆشدەوێ، بۆ ئەوەی ئێمە بزانین خۆشەویستی خوامان لە دڵە، نیشانەکانی چیە .. ؟ یەکەم ـ نیشانە ئەوەیە هەموو کاتێك حەزدەکەی بەخزمەت خوای بگەی ﴿من أحب لقاء الله أحب الله لقاءه﴾ ئەو کەسەی بیەوێ خوای گەورە ببینی و بەخزمەت خوای گەورە بگا. خوای گەورەش بەهەمان شێوە خوای گەورە رەخنەی لەجولەکەکان گرت فەرمووی :﴿ فَتَمَنَّوُاْ الْمَوْتَ إِن كُنتُمْ صَادِقِينَ ﴾ (البقرە:٩٤) ئەیانگوت ئێمە خۆشەویستی خواین ، ئێمە هەڵبژاردەی خواین ئێمە خۆشەویستی خواین، خوای گەورە چی فەرمووی : دەمادام وایە بەڵگەتان چیە ؟ ئەگەر ڕاست دەکەن :مردن هەڵبژێرن بابە خزمەت خوا بگەن ﴿ان کنتم صادقین ﴾ئێ واشنیە کەواتە درۆ دەکەن، دەی ئەگەر ئێمەی موسڵمان لەمردن بترسێن، بەڵگە ئەوەیە کە ئێمە خۆشەویستی گەیشتن بەلیقائی خوامان نیە! مرۆڤی موسڵمان لە بەندیخانەیە ﴿الدنیا سجن المؤمن وجنة الکافر﴾

ژیانی گرتووخانــه حیـــساب دەكـا ، كـەی لێبوردنــت بــۆ دێ، كـەی رزگاریت ئەبێ لەو بەندیخانــە، ئەگـەر ڕاســت دەكـەین خۆشەویــستی خوامان هەیە، تەمەنا دەكەین ئەو ڕۆژە كە دەمرین وبەخزمەت "رب العالمین " دەگەین، بەس كاتێك كەلەمردن ترساین، بزانە بەتایبــەتی خۆشەویــستی خوامــان لــە دڵ لاوازە ، دووەم شــت: دەســت بگــرین پابەندی بكەی بەوەی خوای گەورە ڕەوانی كردیە، یەك لە بەڵگــەكانی خۆشەویستی ئەوەیە هەرچی خۆشەویستەكەت بڵێ، دەبێ جێ بەجێی بكەی، خۆ ئەگەر كچێك بەكوڕەك بڵێ كاكـە ئـەوەم دەوێ ، واللــەی قەردی حەفتا كەسی كردبی بۆی پەیدا دەكا ، هەزار درۆی بۆ كردبی، قۆڵی هەزار كەســی بــۆ بڕیبــی، بــەس دەچــی جــێ بــەجێی قــسەی خۆشەویــستەكەی دەكــاتن ، دەی مــادام ئێمــەی موســڵمان دەڵــێین پاگەندەی خۆشەویستی خوای گەورە دەكەین ، دەبێ پابەنــد بــین بــەو فەرمانانەی خوای گەورە لەسەر ئێمــەی پێویــست كــردووە ، هــەموو فەرمانەكانی زۆر بە ڕێــك وپێكــی جێبــەجێ ئــەكا ، ئەگــەر دیتــت كابرایەك گوێ ناداتە قسەكانی خوای گەورە، ڕێنمایی وخواپەرستی و گوناهەكانی، بزانە ئەوە بەڵگەیە ڕاست ناكا، خۆشەویستی لەناو دڵی زۆر كەمە..سێیەم شت: هەردەم لەهەموو حاڵەتێك دا یادی بكــەی، جل لەبەر دەكەی ﴿الحمدلله الذي كساني هذا مــن غيرحـول مــني ولا قوة﴾ یەكسەر سوپاسو ستایشی خــوا دەكــەی ، ســوپاسو ستایــشی

خۆشەویستەکەی خۆت دەکەی، کە ئەو جلەی پێ بەخشی، کاتێك کە لەبەردەکەیەوە نزای دەکەی ، نەعلی لەبەردەکەی، پێڵاوی لە پێ دەکەی یادی خوا دەکەی ، دەچیتە دەرێ ﴿ بسم الله توكلت على الله ولاحول ولا قوة الا بالله ﴾ هەتا چوونە ئاودەست، حاشاکی رووی جەنابتان، مرۆڤ کە دەچی دەچێتە سەر ئاو، نزا دەکا ، لەگەرماو دێتە دەرێ هەموو هەستان و دانیشتنێکی ئەو کابرایەی دەبی بۆپەیوەندی بێ لەگەڵ خوای، نابێ پشت بەدەروونی خۆی ببەستێ نا.. هەموو هەستان و دانیشتنی هەر یادی خوایە ، کە دوکانی دەکاتەوە بەناوی کێ دەست پێ دەکا، نالێتە دراوسێیەی نەرێ ئەمرۆ زێرپەچەندیە، دۆلار بەچەندیە نا... هەروەك ئەوە یەکێکی لەگەڵە، چونکە مرۆڤ بەتەنێ تووشی دڵتەنگی دەبی، تووشی دڵ توندی دەبی ، بەڵام ئەگەر یەکێکی بۆ پەیدا بوو، یەکسەر ئەو موزایەقەو دڵ توندیە دەڕوا ، کەسێك ئەگەر بەتەنێ لەگەڵ خوای خەلوەت بکا دەبێ ئاوا بێ، کابرایەکیان دیت لەسەر بەفرێ گوتیان : کاکە ئەوە تۆ هەست بەسەرما ناکەی؟ هەمووقاچت تەزی؟ گوتی : بەخوای ئەوەی خوا ئەنیسی بێ، نازانێ سەرماوو گەرما چیە..لەبەرئەوەی ئەتوو هەر لەگەڵ خوای خۆت سەرقاڵی، چ ئاگات لە وەیە سەرمایە یان گەرمایە.. پێنجەمین : ئەو کابرایە زۆر گرنگی بە دونیایێ نادا ، زۆر گرنگی بەوە نادا، ماڵەکەم ئەترۆماتکۆ بکەم، ماڵەکەم نەخشی

(مەغریبی) بکەم، یاخود سوپەرەکم هەبی وئەوەم هەبی وئەوەم هەبی، هەردەم دەنگ و باسی وخواسی ئەوکابرایە دونیایە ، ئەری ئەوەم نەکڕی ئەرێ ئەوەم نەبوو، ئەرێ ئۆتۆمبێلم نەگۆڕیەوە ، ئەوە بەڵگەی ئەوەیە خۆشەویستی خوای گەورەی لە دڵدا نیە زۆر گرنگی بە دونیا ئەدا ﴿وَلا تَنسَى نَصِيبَكَ مِنَ الدُّنْيَا﴾ القصص:٧٧ بەقەدەر پێویستیەکانی خۆی لە دونیا، تام و لەزەت وپێویستیەکانی خۆی وەردەگرێ، بەڵام هەرگیز زیادە خەرجی لێ ناکا .. شەشەمین شت: کاتێك کە قسەی خوای گەورە دێتە گۆڕێ قورئان خوێندن بی، یان وتارەك بی، قەت حەزناکا ئەم قورئانە (قطع) بکا . لەبەرئەوەی ئەوەندە تام ولەزەتی لەنامەو نێردراو ڕیسالەکەی خۆشەویستەکەی خۆی ئەبینێ ، چونکە ئەو قورئانە ئەوە قسەی " رب العالمين "ە، هەرکەسێکیش خۆشەویستی " رب العالمين "ی لە دڵدا بێ هەرگیز هەرگیز حەز ناکا یەك خولەك لەو قورئانە دوور بی، با نموومەیەك بینمەوە دەبینی گەنجێك خۆشەویستەکەی نامەیەکی بۆ دەنوسی، بڕوا بکە ئەو نامەیەی بەبیست جۆر دەخوێنێتەوە .جارێك دەیخوێنێتەوە لە ناو بەرکی دەنێ، پاش پێنچ دەقەی دیکە دووبارە دەری دەهێنی، ئەو جارە دەڕوا لە قوژبنەکی دەیخوێنێتەوە، .شەوێ چوار جاری تر لەسەر جێ دەیخوێنێتەوە! لەبەرچی .؟ لەبەرئەوەی تامولەزەت لەخوێندنەوەکەی دەکا. باشە مادام تۆ عەشقی خوای و خۆشەویستی

خوات لەدڵە ئەوە نامەی خوایە ڕیسالەکەی خوایە، دەبزانە ئـەو تـام ولەزەتەی لێدەکەی کە ئەو تام ولەزەتەی ئەهلی دونیا لێـك دەکـەن ، دوو هاوەڵی پێغەمبەری خوای (ﷺ) عمـاری کـوری یاسـروعوبادی بـشر، کاتێـك پێغەمبـەر لەغـەزوەی "ذات الرقـاع " بـوو، وەبـزانم گەڕایەوە فەرمووی : کێ ئەم شەو پاسەوانیمان لێـدەگرێ .؟ ئـەو دوو هاوەڵە گوتیان : ئێمە یارسـول اللـە، تـۆ بخـەوە ئێمـە پاسـەوانین . عەماری کوری یاسر گوتیە .عوبادی ئەتوو حەزدەکـەی یەکـەم جـار بنووی یان لە دوایی بنووی ، گـوتی : تـۆ یەکـەم جـاری بنـوو مـن لەدوای دەنووم . گـوتی : باشـە . عـەماری کـوری یاسـر نووسـت . عوبادی کوری بشر بەخەبەر بوو پاسەوانی گرت گوتی : ئێ باشە بـۆ من ئێستا دەست بە شەونوێژی نەکەم هەم ئاگام لێیانەو هەم شەونوێژ دەکەم، دەستی بە شەونوێژێ کرد، دەستی بەقورئان خوێندن کرد، لەو کاتەدا بێ باورێك پێیزانی ئەوە پاسەوانە هەتا تیر دەگـری لـە پـشتڕا لێیدا عوباد،کە لێیدا نەیگوت ئۆف نـەیگوت : ئـاخ . ئایەتەکەشـی نەبڕی، هێدی هێدی خوێندیەوە ، ئەوجارە دووەم تـیری لـە پـشتی دا تیر زۆر دێشی . تۆ مێروستانەك پیتوە دەدا، نوێـژی بـەتاڵ دەکـەی، کابرا تیری بە پشتی کەوی، دەبی چ ئەزیەتەك بی ، واخوێن لە پشتی چۆرەی دێ، دێتە خوارێ، دووەم تیریشی لێدا، ئەوە نوێژەکـەی خـۆی نەبڕی . سێیەم . تیری لێـدا زۆر بـەئازار بـوو هەسـتا پێیـەکی لـە

عەماری دا، هەڵستە هەڵستە پێی لێدا واتە هەستە ، کەهەستا دیتی ئەو کابرایە وەختە بەر ببیتەوە گوتی : ڕەحمەتی خوات لێبێ بۆ نوێژەکەت نەدەبڕی ،فەرمووی : واللەی لەبەر ئەوەی پاسەوانی پێغەمبەرم (ﷺ)ئەگەر پارچە پارچەی بکردمایە ئایەتەکەم نەدەبڕی " سبحان الله " بەس لەبەرئەوەی پاسەوانی هێزی موسڵمانان بووم، پێم شەرم بوو قورئانەکە ببڕم تاکو تەواوم دەکرد، بەڵام ترسام کافران زەفەرێکی ترمان پێببا .ئەوە خۆشەویستی ئەوە خۆشەویستیە ، بەڕاستی کاتێك ئێمەش دەچینە تازیەکی قورئان دەخوێندرێ، فیتەی جگەرەمان دێ، ئەوە لەگەڵ وەی قسەی دەکا، ئەوە لەگەڵ وەی قسەی دەکا ، توخوا ئەوە خۆشەویستییە، توخوا ئەوە حورمەتەو ڕێزی وتەی و نامەکەی خۆشەویستەکەمانە ئاوا دەکەین ئاخر نیشانەی ئەو کەسانەی کەوا نیشانەی خۆشەویستی خوایان لە دڵە، ئەوەیە کەوا زۆر لێی دەترسێن. لەبەرئەوەی زۆر بە ئاگایە، خوای گەورە لێی توورە نەبیێ ، زۆر بەحەزەرە " رب العالین " لێی نەڕەنجێ . شتێکی وا نەکا بەئاستەم و دووبارە خوای گەورە لێی تووڕە ببێ . یان خوای گەورە گلەیی لێ بکاتن، خۆ ئەگەر خوانەخواستە یەك شتیشی لێ قەوما، سەهوێکی لێ قەوما، بەخەتایەك گوناهێکی کرد، دەست بەجێ دەست نوێژێك دەشواو دوو ڕکعەت نوێژی تەوبە دەکا . بۆیە پێغەمبەر دەفەرمووێ : ﴿انی لأستغفر الله في يوم مئة مرة ﴾ ئەوە

پێغەمبەری خوایە (ﷺ) یەك دەقەش لەخوا بێ ئاگا نەبووە، ئینجا ڕۆژێ سەد جاران تۆبەو ئیستغفاری کردیە ، ئەی پێغەمبەری خوا نەی فەرمووە : هاوەڵەکان، ئەمە باسی ئەو فەرموودە ناکەین ﴿وأتبع السيئة الحسنة تمحها ﴾ کابرای موتەقی ئەگەر سەهوێکیش لێی ڕوویدا، زوو دەست نوێژێك بشۆو دوو ڕکعەت نوێژی تەوبە بکەو خێرێك بکە، بۆ ئەوەی فریشتە گوناهەکەت بسڕنەوە، بەلکو دەفتەرەکەت بە سپیاتی وبێگەردیەتی بێنێتەوە ، ئەگەر خاڵێکی ڕەشیش لەسەر دڵت پەیدا بووە، بەچاکەکەی یەکسەر لادەچێت لەسەر دڵت و گوناهەکەی ڕەش دەکەنەوەو دڵەکەت بە ساف وبێگەردی ئەمێنێتەوە ، جا ئەگەر ئاوامان کرد ئەوا بوینە خۆشەویستی خوا، خۆشەویستی خوامان ئاوا لە دڵدا بوو واللەی هەر نزایەك بکەین گیرایە ، واللەی هەر شتێك داوا بکەین گیرایە ، تەماشاکە أبو حفص یەك لە پیاوە چاکەکانە تابعییەك هاتە لای و گوتی : یا امام کوێدرێژم ون بووە. فەرمووی : خوایە بەعزەت وگەورەیی تۆ یەك شەقاو ناوێم، هەر گوێدرێژەکەم ئێستا دەوێ. یەکسەر گوێدرێژەکە هاتەوە، هەر بەخۆشیان نەیانزانی ئەو گوێدرێژە چۆن هاتەوە یەکسەر جڵەوی گرتوو دایەوە دەست خاوەنەکەی وگوتی : بڕۆ. "سبحان الله" ابراهیم الخواص یەك لە پیاوە چاکەکانە خەلکی بەسڕایە، ئاگر لە خانووەکەی بەربوو، دیتی ئەوە ئاگری تێبەربووە،

ڕاست چووە نـاو ئاگرەکـەی هەرگوێشی نـەدایێ گوتیـان : کـورە دەسوتێی .. گوتی : کوڕە بابە سوێندم خواردیە خـوا نەمـسوتێنێ ، سوێندم خواردیە گوتم: خوایە واللەی سوێندم بەعزەت و گەورەیی تـۆ نابی بم سـوتێنی .. لـە نـاو ئاگرەکـەش فـەمووی : خوایـە قەسـەم بەگەورەیی توو، دەبی ئەو ئاگرە بکوژێتەوە ئاگر بەبێ نـاو کـوژاوە . کاکە خەڵك دەگاتە ئەو پلەیەیەی هەر شتێکی لە خـوای داوا بکـا، یەکسەر جێبەجێ دەکرێ بەبێ دواکەوتنی . تەماشاکە ئـەبو موسـای ئەشعەری لە بەسڕای والی بوو لەوکاتەدا گەنم ئاگری تێبـەربوو، هـی یەك پیرەمێردی نەسوتا، لە ناوەندی ئاگرەکەش بوو نەسـوتا .. ئـەبو موسای ئەشعەری بانگی کرد گوتی : توخـوا خالـەگیان بـۆ هـی تـۆ نەسوتا . گوتی : کاکە کە دیتم ئاگری تێبەربوو گوتم : خوایە سـوێند بەگەورەیی تۆ، نابێ هی من بـسوتێنی ڕاسـت نەسـوتا . ئەبوموسـا فەرمووی والله پێغەمبەر (ﷺ) ڕاستی فەرمووە کە دەیفەرموو : لە نەتەوەی من پیاوانی وا پەیدا دەبی ﴿لو أقسم على الله لابره﴾ ئەگەر بلێ خوایە دەبێ ئەوەی بکەی سوێند بە تۆ، یەکسەر خوای گەورە لـە بۆی دەکاتن ، جا خۆزگە ئێمەش ئەوا بین ، خۆزگـە ئێمـەش بتـوانین ئەو خۆشەویستیە دروست کەین لەگەڵ خوا ، کاتێك کە هـەر شـتێك لەخوای گەورە داوا بکەین، یەکسەر خوای گەورە جێ بەجێ ی بکاتن ، خۆئەگەر دەڵێن بابە شاری هەولێرێ بێ پیاوی چاك نیـە، ئـەی بـۆ

باران نابارێتن وانیه؟ پرسیاره زۆر دەكرێ .. دەزانی بۆ باران ناباری .؟ چونكه ئێمـه عەقیـدەمان وای لێهـات وامانـدەزانی ئـەمریكا ئـەو قەرارەكەی نۆسەدوهەشتاوشەشەی تێكبدا لەگەڵ سەدامی، ئێمـه لـه برسان دەمرین . خوا دەسەلمێنێ بەخۆی ڕازیقه . بۆیه باران نابـارێتن، هەڵبەت هەموومان ئەگەر عەقیدەمان وا نەبێ خوا ڕازیقەو كەسی تر ڕازیق نیه؟ جا هیوادارم ئیمه بتوانین ئاوا له خـوا بـچینه پـێش ئـاوا خۆشەویستی لەگەڵ خوا دروسـت بكـەین، ئـەو كـات تـامو لـەزەتی بەندایەتی دەكەین، تام وچێژی ڕۆژیونوێژەكانمان دەكەین، تا شەوێكی تر بەخوای گەورەتان دەسپێرم ...

*والسلام عليكم ورحمه الله وبركاته*

# بەشی سێ یەم

بسم الله الرحمن الرحيم

الحمد لله رب العالمين والصلاة وسلام على حبيبنا محمد وعلى الـه وصحبه أجمعين. السلام عليكم ورحمة الله وبركاته . .

برایانی بەڕێزم : میوانانی ماڵی خـوا ئێمـە گوتمـان : پێغەمبـەر دەفـەرمووێ: (اتـق الله حيـث ماكنـت ) سـەرەتایی فەرموودەکـەی ئەوەیە گوتمان : پێغەمبەر دەفەرمووێ: تۆ تەقوای خوای بکە لە هـەر شوێنێك بی ، پاشان هاتینـە سـەر وتەیـەکی ئیمـامی غـەزالی کـە دەفەرمووێ : ئەوکەسەی کە دەیەوێ تەقوای خوای بکا، دەبـێ پێـنج شتان بپارێزی (**یەك: زمان**)، (**دوو:چاو**)، (**سێ: گوێ**)، (**چوار: دڵ**)، (**پێنج :گەدە**) . پاشان پرسیارێکی ترمان کرد، گوتمان : چۆن ئەم پێنج شتە بپارێزین؟ بە چ شێوازێك ئەم پێـنج شـتەی بپـارێزین؟ یەکـسەر چمان بۆ دروست، ئەبی، یەکسـەر "تەقوا " مان بـۆ دروسـت نـەبی، وەکو تەقوامان بۆ دروست بوو، ئێمە ئەو فەرموودەی پێغەمبـەرمان جێبەجێ کرد کەبە ئێمەو هەموو هاوەڵەکانی ئەیفەرموو : (اتـق الله حيث ماكنت) جا ئێستا بەشی یەکەمان شەرح کرد کە چ بوو . (محبـة

اللە) بوو، یەکەم شت کە ئێمە بمانەوێ واز لە گوناهان بێنین، ئەندامەکانی لەشمان بپارێزین لەگوناهان، دڵ و زگ و گوێ وچاو و ئەوانەمان بپارێزین لەگوناهان، ئێمە خوای خۆمان خۆشبوێ ، بنەمای پەیوەندی لە نێوان بەندە لەنێوان خوای خۆشەویستیە . چونکە زاتی مرۆڤ بۆ خۆی پارچە ڕەحمەتێکە، لە زاتی پاکی " اللە " کە خوای گەورە درووستی کردوە . ئێمەی موسڵمانان هەریەك لە ئێمە پارچە ڕەحمەتێکە، خوای گەورە دروستی کردیە ، ئەو پارچە ڕەحمەتەش هەر دەبێ بە ڕەحمەت هەر بە خۆشەویستی، هەر بە خۆشەویستی پەیوەندی لەگەڵ زاتی پاکی " اللّٰە " پەیدا بکا ، ئەوە هەڵەیە بڵێ واللە مرۆڤ " یتحدی الطبیعة " یان سروشت.؟ وەدیهێنەری سروشتی، چۆن تۆ دەتوانی تەحەدای بکەی؟ بەڵکو مرۆڤ چ دەکا .؟ تەسخیری سروشت دەکا، لە بۆ ئەوەی گوێرایەلی خوای گەورەی پێ بکا، سروشت دەستەبەر بکا بۆ ئەوەی خزمەتی خۆی و خزمەتی مرۆڤایەتی پێدەکاتن ،دەی کەواتە ئەسڵی پەیوەندی نێوان ئێمەو نێوان " رب العالمین " چیە .؟ خۆشەویستیە ، نەخوا رکابەری لەگەڵ ئێمەیە نەئێمەش کێشەمان لەگەڵ خوای هەیە ، نەخێر ئەم تێگەیشتنە هەڵە تێگەیشتنێکی بۆگەنی غەربە کە دەڵێ، خوا ناکۆکی لەگەڵ مرۆڤ هەیەو مرۆڤیش ناکۆکی لەگەڵ خواو سروشت هەیە، نەخێر بەڵکو ئێمەو پەیوەندی ئێمە لەگەڵ خوا تەنها

خۆشەویستیە، پەیوەندی خۆشەویستی هیچیتر نیە .جا ئێمە ئەگەر بەو پەیوەندییەوە لەخوای چووینە پێش، زۆر زۆر بە ئاسانی خوا ئەناسین ، زۆر زۆر بە ئاسانی هەموو پێویستیەکانی جێ بەجێ دەکەین ، هەروەها تام و لەزەتیش لە بەندایەتی خۆمان دەبینین، چونکە زۆر مەرجە ئێمەی موسڵمانان کە ئەو پێویستیانە جێ بەجێ بکەین، تام و لەزەتی لێ ببینین ئەمن ناهەقی کابرایەکی ناگرم، بۆ نمونە بیست ساڵە نوێژ دەکا، هیچ تام ولەزەتی لێ ناکا واز دێنێ، ناحەهەقی ناگرم لەبەرئەوەی بیست ساڵە نوێژی دەکا، تەنیا نوێژەکەی کردووە. نوێژەکەی لەسەر خۆشەویستی لەگەڵ خوا نەکردوە، بۆیە هیچ تامی لێی نەکردوە ، لاشەیەکی وشك بەبێ ڕوح بەبێ خۆشەویستی هەر چەمانەوەو کرنۆشی بردیە . خۆشترین بەندایەتی خۆشترین لەزەت لە دونیایێ ئەوەیە تۆ تام وچێژی خۆشەویستی " رب العالمین " بکەی جا ابنوالقیمی الجوزیە - ڕەحمەتی خوای لێبێ دەفەرمووی : خۆشەویستی دارێکە، ئەو دارە ڕەگەکەی زەلیلیە بەرامبەر خوا، ئەو دارە ڕەگەکەی کە شین دەبی، ئەوە زەلیلە قەدەکەی کە لە ناوەندێ هەڵدەستێت، ئەوە پێی دەڵێن مەعریفەتە، ناسینی خوایە . سێیەم : شت لقەکانی کە دەبتەوە دەڵێ : ترسانە لەخوا ، گەڵاکانی دەڵێ : ئابڕووە شەرمە لە خوا، بەرهەمەکەی تاخواپەرستی، ئەی ئاوەکەی دەڵێ زیکری خوایە ، ئیستا دێین ئەوە

شەرح دەكەین، چونكە ئەگەر ئەوە تێگەیشتن، خۆشەویستی خوامان دەكەوێتە دڵی، هەم خوا ئێمەی خۆشدەوێ هەم ئێمەش " رب العالمین " مان خۆشدەوێ ، خواپەرستیو بەندایەتیەكەمان بە تام ولەزەت دەبێ ، ئەوسا كابرایەك كە نوێژێ دەكا، دەزانی چ نوێژێك دەكا . ئەوجا دەزانی تام و لەزەتی ئەو یادكردنە چەند خۆشە، كاتێك كە ئەو وا لەبازاڕیە خەڵك خەریكی دۆلارو كڕین و فرۆشتنەو قەرەبالغی و هەرایە، ئەو چەند جارێك ئەڵێ ﴿لااله الاالله وحده لاشریك له له الملك وله الحمد یحیی ویمیت وهو علی كل شئ قدیر ﴾ ئەوجا تام و لەزەتی ئەو پاكردنی دەكا . كە خەڵك سەرقاڵن، جا یەكەمین: شت ئەوكەسەی دەیەوێ، داری خۆشەویستی لە ناو دڵی خۆی بڕوێنی، دەبی زەلیل بی بەرامبەر خوا . كوڕە نەكەین خۆمان بە شتێك تێبگەین، بەرامبەر بەخوا، نەكەین فیز لێبدەین بەرامبەر بەخوا.. چونكە خوا لە فەرموودەیەكی قودسی دەفەرموێتن : ﴿الكبریاء ردائی والعظمة ازاری ﴾ دەفەرمووێ: خۆبەگەورەزانیو خۆ بەزل زانی ئەوە شمەكی منە پۆشاكی منە، كوڕە نەكا كەس لەبەری بكا، ئەگەرنا پشتی دەشكێنم!، چونكە ئەوە بەرەنگاری خوای دەكا . چونكە ئەوە پێشبڕكێی خوای دەكا ، عەزەمەت و خۆبەزل زانی عەزمەتی هەر بۆ زاتی پاكی الله یە، جایەكەمین شت ئێمە بچین خۆمان تەسلیمی خوا ی بكەین و خۆشەویستی لەگەڵ ببەستین، دەبی

زۆر بە زەلیلی یەوە بچینە بەر قاپی خوا، بلێین خوایە من چیم، خوایە من هیچ نیم لە بوونەوەر، یەکین من وبالندەیەك، هەر ئاژەلێكو من؟ هەر یەکین بەلاّم ئەوی من لەوی جیا دەبمەوە، بە خواپەرستی تووە، ئەگەر نامن و ئاژەلێك وەکو یەکین، دەفەرموویت خوای گەورە ﴿اولئك کالانعام بل هم أضل﴾ هیچ جیاوازی نییە ئەگەر ئەو بەندایەتیە نەبیّ ، ئەگەرکرنۆش وسوجدەو زەلیلی نەبیّ جیاوازیت نیە لەگەلّ ئاژەلێك، خوای گەورە نەك ئەوە بەلکو دەفەرمووێ ﴿ بل هم أضل ﴾ زۆر زۆر لە ئاژەلەکان خراپ ترن وپیسترن، مەڕە سوودی لیّ دەکریّ، مەڕە گۆشتی دەخوریّ پیستەکەی بەکاردیّ شیروماستەکەی دەخوریّ ، بەس مرۆڤ تۆ چیی ..؟ بەس تۆ بوونەوەر خراپ دەکەی، مالّی خەلّك کاولّ دەکەی، فەساد بلاو دەکەیتەوە، خەلّك دەکوژی مالی خەلّك تالاّن دەکەی، خۆزگەت لە مەڕەکەی ، لە حوشترەکەی خۆزگەت لە مریشکەکەی!، دەی کەواتە ئێمە و ئاژەلّ لێك جیا ئەبینەوە بەخوا پەرستییە، دەبی ئاوا بچتە بەرقاپی خوا، دەبی خۆت تەسلیم بکەی، خۆت زەلیل بکەی بەرامبەرخوا، نەکەی فیزو خۆ بەگەورەزانی بکەی، ڕۆژێك یەك مسقالە زەڕە بێتەناو دلّ، پێغەمبەر ـ علیه الصلاه والسلام ـ دەفەرمویّ : (ناچێتە بەهەشت کەسێك مسقالە زەڕەیەك خۆ بەزل زانی لە دلّدا بیّ) لە بەرچی .؟ چونکە ئەوە ڕەگە ئەگەر ڕەگەکە شین نەبیتن، هیچ خۆشەویستییەك شین نابیتن ، ئەگەر دار

ڕەگی نەڕوێ وشك دەبێ . ڕەگەکان ئیشیان ئەوەیە، ئاو بمژێتن تاقـەدو بالاّی ئەو دارە بەرز کەنەوە، بەس کە تـۆ ڕەگـت وشـك بـوو، تـەواو بەخۆت وشك دەبی . داری خۆشەویستیش سەرەتاکەی چیە .؟زەلیلیە بەرامبەر خوا، مرۆڤ زۆرخۆی زەلیلکا بەرامبەر بـەخوا، بلـێ خوایـە واللەهی من هیچ نیم، قەسەم بەعەزەمەتی تۆ من هیچ نیم، گەر تـۆ بمکەیتە شتێك گەر تۆ غـەمێکم لێ بخۆیـت، گـەر تـۆ ڕەحمـەکم پـێ بکەی، ئەگەرنا من هیچ نیم مـن ئـەوە نـیم بەرامبـەرت ڕابوەسـتم، ئەسلەن کە ئێمە نوێژ ئەکەین واللەی گەورەترین بەخششە کە خـوای گەورە بە ئێمەی بەخشیوە، کوڕە ئێمە زۆر سـەیرین، ئـەو پیـاوە نـین بەرامبەر بەخوا ڕابوەستین قسە بکەین ، واللەی . ئێمە ئەو پیاوە نـین بەرامبەرخوا قسە بکەین . بەس ئەوا خوایە ڕەحمی بە ئێمە کـردوە ، ئێمە ئەو پیاوە نین قسەی خـوای گـەورە بخوێنینـەوە، بـەس خوایـەو ڕەحمی بە ئێمە کردوە، قسەی خۆی بۆ ئێمە ڕەوانە کردوە، کـە ئێمـە دەیخوێنینەوە ، دەی کەواتە نەکەن ئەبەدەن خۆبەزل زانی بکەتـە نـاو دلّتان، لەبەرئەوەی واللەی هەرکەسێك خۆ بـەزل زانـی بکەوتـە نـاو دلّی، لەبەرچاوی خواش دەکەوی، لە پێش چاوی خەلّکیش دەکەوی ، بالّندە هەرچەندە بەرزبیتەوە بلّنـد بـی، لەبەرچـاوی خـەلّکی بـچوك دەبێتەوە ، تۆش هەرچەندە فیز لێبدەی خۆ بەزل زانی لێبدەی، کاکـە واللەی کەم دەبیتەوە لەپێش چاوی خوا، لەپێش چاوی خەلّکیش، جـا

وریا بـین یەکـەمین دەرگـا کـە دەچـینە ژووریَ تـا بـچینە نـاو داری خۆشەویستی، ئەبی بە زەلیلیەوە بچین بەئەودوە بچین، خۆمان زەلیـل و زەبون بکەین، بەرامبەربـە " رب العـالمین " تەماشـا کاتێـك ئـەو هەلوێستەی پێغەمبەرم خوێندەوە ـ علیه الـصلاة وسـلام ـ زۆرم پـێ سەیر بوو زۆرم پێ غەریب بوو دەمگوت : بۆ پێغەمبەر ئاوای گوتیـە : کاتێك کە پێغەمبەری خوا چووە شاری تائیف، لـە تـائیف زۆر بـە نامەردانە وەلامیان دایەوە، چووە لای سەرۆك هۆزەکـان گـوتی: مـن پێغەمبەری خـوام هـاتووم ئامۆژگاریتـان بکـەم، لـە ئـاگری دۆزەخ نەجاتتان بدەم، ئەوان هەستان چـەند منداڵـە وردکـە هـەبوو، چـەند بەندەی ڕەش هەبوو، بەدوو پێغەمبەریانداو دایانە بەربەردان! سـبحان الله پێغەمبەری خوا خۆشەویسترین کـەس لـەلای خـوا، گـەورەترین کەس لەلای خوا ، دەدرێتە بەربەردان، کەتنـە دووی بەبـەردان لێیـدە لێیدە هەتا دوورکەوتەوە ، کاتێك لەبن دارێکی بوو چی دەگووت : " اللهم إنی أشکو إلیك ضعف قوتی وقلة حیلتی وهواني علی الناس " تەماشاکە " هواني علی الناس " جەرگی زۆر سـوتاندم دەمگـوت : دەبێ پێغەمبەر بۆ وابلێت .؟ دەیگوت : خوایە لای تۆ سکالای حاڵی خۆم دەکەم، ئەمن بێ توانـام زۆر بـێ توانـام، لەوانەیـە لەگـەڵ ئـەو لێدانەی سارد ببمەوە، جارێکی تر دەعـوە نەکـەم، ئـیلا دەبـی خـوا گەرمی بکا، خوای گـەورە گـەرمتری بکـاو پـشتگیری بکـاتن، مـن

چارەسەر نازانم، نازانم چ لە خەڵکی بکەم هەروەها، شکایەتی کەمی خۆم بەرامبەر خەڵکی، شکایەتی حاڵی خۆم بەرامبەر خەڵکی . بزانە چەند خۆی زەلیل کرد ئەو پێغەمبەرەی خوا ـ علیە الصلاە والسلام ـ برام ئەوەیە خەڵك نەیباتەوە، ئەلێرەیە خەڵك بەخزمەت خوا دەگاتن، ئەلێرەیە دەچتە ژووری، کابرا نوێژ دەکا خۆی بە شتێك تێدەگا ، هەر لە ناو نوێژە خۆی بە شتەك تێدەگا، ئەوا خوا پێی نادا، بەخوای نەتامی ئیمان و نەحەلاوەی ئیمان، هیچ شتێکی پێ نادا، هەتا ئەو دڵەی لەکیبرو ئەوانە پاك نەکاتەوە، ئەوجارە کە ئەو قۆناغەی بڕی دێتە قۆناغی دووەم : کە ناسینی خوایە . دووەم :شت قەدی دارەکەیە، ئەوە ڕەگەکەیە روا، ئەوجارە چیە .؟ ناسینی خوایە . ئەلێرە تۆزێك دەوەستین، لەبەرئەوەی خاڵێکی زۆر زۆر گرنگە. هەرچەندە مرۆڤ خوا بناسێ، دوو شتی بۆ دروست دەبێ یەك خۆشەویستی. دوو ترسان. خۆشەویستیەکی زۆر دارەکە قەڵەو دەبی، ئەستور دەبی، دوو ترسانەکی زۆری لێ دەنیشێ . هەرچەند تێبیر بکەیتەوە لە عەزەمەتی خوا لە دروستکراوەکانی خوا لە قورئانەکەی خوا، ئەوەندە تۆ شەرمو ئابروو ترسو خۆشەویستی " رب العالمين " ت بۆ دروست دەبێتن، تەماشاکە ئەوەی ئێمە خوای پێ بناسین، دوو شتە، یەکەمینیان : قورئانی پیرۆزە . دووەمینیان : ئەو بوونەوەرە لە دەوراو پشتمانن . ئەو قورئانە لەگەل بوونەوەر، هەردووك بەرامبەر

یەکن، ئەمە قسەی خوایە، بونەوەرەکەی دروستکراوی خوایە . ڕۆژێك لە ڕۆژان هەر بیردۆزەکی زانستی پەیدا بی، هەر لەکۆتایی دەبێ هاوڕای ئەو قورئانە بی، کە لەلایان خواوە هاتۆتە خواری، ئەستەمە بلێ ئەو بیردۆزە ئایەتێك بەتاڵ دەکاتەوە .نەخێر شتی ئاوا نیە . جا زۆرم پی سەیرە بۆ نمونە کابرایەك پاش بیست ساڵ، سی ساڵ لە تاقیگەیەك راستییەکی زانستی ئەدۆزێتەوە، موسڵمانان دەڵێن ئەوەش لە قورئاندا هەیە، کوڕە هەر وامەڵێ بڵێ ئەوە چیە دۆزیتەوە .؟ شتی تری زۆر سەیر تر هەیە هێشتا نەدۆزراوەتەوە، واتە تۆ قورئانەکەی مەهینە ئاستی زانستەکە، زانستەکە بینە ئاستی قورئانەکە، بۆ خۆی لە سەرەوەیە، زانستەکە وا بۆ خۆی بەرەو قورئان دەچی، نەك تۆ پێچەوانەی بکەی، زانستەکە لێرە دابنێی ئەوجا قورئانەکەی بینی، بڵێی ئەها قورئانیش ئەوها دەڵێ، نەخێر بڵێ زانست ئەوەی سەلماندووە، کە لە ناو قورئانیدا هەیە . دەبی ئەوها بی، دەبی زانستەکە خزمەت کاری قورئانەکە بێ، زانستەکە جێگیر بی کە ڕۆژ بە ڕۆژ ئەو قورئانە شتی " عظيم " ی تێدایەو شتی وای تێدایەکە مرۆڤ باوەڕی پی نوێ دەبێتەوە، هەروەها مرۆڤ عەزەمەتی خوای بو بە دیار دەکەوی . ﴿سَنُرِيهِمْ آيَاتِنَا فِي الْآفَاقِ وَفِي أَنفُسِهِمْ حَتَّى يَتَبَيَّنَ لَهُمْ أَنَّهُ الْحَقُّ أَوَلَمْ يَكْفِ بِرَبِّكَ أَنَّهُ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ شَهِيدٌ﴾ (فصلت : ٥٣) تەماشاکە " سنريهم " خوای گەورە "سين " و " سوف " ە

هەیە لە زمانی عەرەبی بۆ داهاتوو " سوف " بۆ " بەعیدە " سین " لە بۆ "قریب " دەفەرمووێ : لەمەودوا ئێمە نیـشانەو عەزەمـەت و بەڵگەی خۆمان بە خەڵکی نیشان دەدەین لەبەرچی .؟ " حتـی یتـبین لهم أنه الحق " هەتا بە بەراستی بۆیـان ڕوون ببێتـەوە قورئـان قـسەی خوایە . بۆیان ڕوون ببێتەوە کە خالیقێك هەیە لەوکەونە ناوی " الله " یە، جا ئێمە بابە عەقڵ بچین دەورانێك بکەین بۆ ناسینی خوا . بۆ ئەوەی ئەگەر ئەو خوایە بناسین لێی بترسـین وخۆشمـان بـوێ یەکـەمین :شت تەماشای پێنج هەستی خۆت بکە، تەماشا چەند جوانە لوتـت، دەمت، چاوت، گوێت، لەگەڵ ئەوەی دەست لێدانی (لەمست) بزانـە، چەند جوانە، چەند جوانی ڕێکخستووە، خـوای گـەورە چـەند جـوانی دانــاوە، گــەورەترین وێنەکێـشی بینــە وەکــو "بیکاســۆ " کــە وێنەکێشێکی جیهانیە "بیکاسۆ"ی بینە بڵێ وەرە تۆ ئەولاشەی مرۆڤ بۆم شێوەیەکی تر دانێ، هەرگیز وەکو ئەو شێوە دەرناچی، قەت وەکو ئەو شێوە ڕێك وپێك دەرناچی﴿لَقَدْ خَلَقْنَا الإِنسَانَ فِي أَحْسَنِ تَقْوِيمٍ﴾ التین/٤ یەعنی لەجوانترین شێوە ئێمە مرۆڤمان دروست کـردوە، بـڕۆ لوتی لێکەوە لە شوێنێکی تر دایبنێ، زۆر ناشیرین دەبی، دەمی ببـە لەسەر سینگی دانێ، نابی ، یـەعنی هەرچـی ئەندامـەکان دەگـۆڕی نابی، هیچ هیچ نابیتن ، تەماشا ئەو جوانەی ئـەو وەدیهێنـەرە ئـەو عەزیمەی، بزانە چەند جوانی دروست کردوە، لێرەیە چاو لێرەیە گـوێ،

تەماشا دەم یەکە گوێ دووە، خۆ ئەگەر ئێمە دوو دەممان هەبا هەر بەهیلاك دەچوین، یەك گوێ مان هەبا بەهیلاك دەچوین، یەك چاومان هەبا بەهیلاك! دەچوین، هەمووی یەك ژمارەی کەم کەی، یان یەکی لێ زیادکەی، یەکسەر کێشە لە ژیانی ئەو مرۆڤە پەیدا دەبی ، جا بەو پێنج هەستەوەرە مرۆڤ، هەموو پێویستیەکانی ژیانی بۆ جێ بەجێ دەبی، دووەم : وەرە تەماشای ئەو ئێسکانەت بکە، بزانە چەند جوان خوای گەورە دروستی کردووە، خۆ ئەگەر دەستمان پێچەوانە بوایە، بەو قورئانەی ئەو ئاوەمان پێ نەدەخوراوە، نەمان دەتوانی ئاو بخۆینەوە، سوێندە ئەگەر چۆکت نەنوشتاباوە قاچت ئاوا جومگەی تێدا نەبوایە، پشتت ئاوا خوار نەبباوە، ملت ئاوا نەجولاباوە واللەی ژیانت زۆر نەستەم دەبوو، زۆر زۆر زەحمەت دەبوو، ژیانت تاڵ دەبوو، لەبەرئەوەی نەتدەتوانی هەڵسوکەوت بکەی، ئەوە وەدیهێنەرە، ئەوە عەزیمە، ئەوە نیعمەتە تەماشا چەند بە شێوەیەکی ڕێك وپێك تۆی دروست کردوە، وەرە تەماشای ددانەکانی خۆت بکە، ئەوا پانزە ساڵە بیست ساڵە نانی پێدەخۆی، رۆژێك دانیشتوی بڵێی بزانم ئەو وەدیهێنەرە چۆنی دروست کردوە، بزانە ئەوانەی بڕەڕن ئەوانەی پاروو قوت دەکەن لەپێشەوەن، خۆ ئەگەر ئەوانە لە پشتەوە بوونایە، هیچ سوودمان نەدەبوو، دەبا خواردنەکەی ببەینە بنەبانێ، ئینجا قەمپارەکی لێبدەین، چەناگەمان ئەزیەتی دەخواردوئازاری دەخوارد،

بزانـــە چـــەند جـــوان خـــوای گـــەورە دروســـتی كـــردوە، ڕیكوپێـــك، ددانەكانیشی ئەوەندە قەییم ومەحكەم دروست كـردووە ئێـسكی پـێ بشكێنە، هیچی لێنایێ، تەماشای گـەدەی خـۆت بكـە، گـەدە وەك خەباتەیە، هەرچی تێدەكەی بۆت حەلی دەكـا، كێكـی تێكـە نینجـا پاقلاوەی تێكە، لە دووی شەربەتی تێكە، لـە دووی گۆشـتی تێكـە، هەرچی تێدەكەی ئەو گەدە زۆر بە ڕێك وپێكی لێت وەردەگری، هـەر هەمووشی حەل دەكاتن ، ئەوجا شتێكی دیكە لەو بوونەوەردا ئەوانـە نازونیعمەتی خوان بەدابەشە، بۆ نمونە هەوا لەبەرئەوەی ئێمە نـاتوانین لـە سـێ خولـەك زیـاتر ژیانمـان بـەبێ هـەوا ببەینـە سـەرێ، هـەوا لەهەمووكون وقوژبنێكی هەیە، لە مزگەوتێ، لـەماڵێ لەسەرشـەقام لەهەر جێیەكی دەچی، هەوا بوونی هەیە لەبەر ئەوەی مـرۆڤ نـاتوانی سێ دەقە زیاتر بێ هـەوا بـژیێ، لەبەرئـەوەی خـوای گـەورە هـەوای پەرتوو بلاوكردیە ، ئـەوجارە لەبـەرەوەی مـرۆڤ دەتـوانی لەسـێ ڕۆژ زیاتر بەبێ ئاو بژی، دەبینی ئاو وەكو هەوای نیە لە هەموو شوێنێكی نیە . هەستا بە پێویستی ئەو مرۆڤە ئاوی دابەشـكردووە، وەرە خـۆر لەبەرەوەی هەموو مرۆڤی گـۆی زەوی پێویـستی بـە تیـشكی خـۆرە لەهەموو شوێنێك خۆری داناوە، باشە گرانترین كانزا ئەمڕۆ چـیە .؟ زێڕە .باشە ئەگەر زەوی هەمووی زێڕ بایە سوودمان لێ وردەگرت.؟! نابەخوای، هەموو زێـڕی دونیایـێ خڕكـەوە یـەك دەنكـە گـەنمت بـۆ

نارِوێنیّ! دەی کەواتە با ئـەتوو لەسـەر زێـڕی بنـوی، وەکـی هیـچت نەداتیّ چ سوودی هەیە، دەی کەواتە خۆر لـە زێـڕی بەقیمـەت تـرە، خۆر کە زیاتر سوودی لێدەکەین، لەو زێڕەی کە هەیە ، دەی کەواتـە تەماشـاکە خـوای گـەورە چـۆن دابەشـی کـردوە ، هـەوا چـونکە پێویستیمانە لە هـەموو شـوێنێك هەیـە ئـاو وەکـو وی نیـە، خـۆر لەبەرەوەی هەموو خەڵکی پێویستیەتی لە هەموو شوێنێکی دانـاوە، تەماشا بکە لە ناو ئاژەڵ ئەو ئاژەڵانەی بچوك زۆر زاوزێ دەکەن، بـە سەدەها بێچوو دەکەن، بەڵام ئەوانەی گـەورەن زاوزێـی کـەم دەکـەن، لەبەرچی .؟ ئەوانەی بچوکن ناتوانن زۆر بـەرگری لـە خۆیـان بکـەن، ئەوە مێشە ئەوە مێرووە، ئەوانە بچوکی لە بونەوەردا ناتوانن بەرگری زۆر لە خۆیان بکەن، بۆیە هەردەم زاوزێیان بە هەزارەهایە مەلایینـە، هەرچەند جاری کاتی زاوزێیان دادیّ هەزارەها هێلکەی دەکا ، بـەڵام یەکێکی وەکو فیل تەمەنی حەفتا ساڵە، حەفتا ساڵ دەژی، چوار جار دەزیّ ، تەماشا لەبەرئەوەی گەورەیە قەبەیە دەتوانی دیفاع لـە بـوون ولە مانی خۆی بکا، بۆیە وەکو مێشی نیـە . باشـە بینـە بەرچـاوت ئەگەر فیلیش وەکو مێشی زاوزێی بکردایـە چ دەقـەوما، ژیـان تـاڵ دەبوو، هەموو شێخەڵلاوبازاڕو مزگەوت هەرهەموو دەبووە فیل!، جا تەماشاکە برام ئەوە وەدیهێنەرە ئەوە رێکخـستنی ئـەو بوونـەوەرەی کردوە، کە ئێمە تەماشای دەکەین فکر لەو شتانە دەکەینەوە، کە ئەو

شتانە تەماشا دەكەین هەر ئەوەندە بڵێین ﴿رَبَّنَا مَا خَلَقْتَ هَذا بَـاطِلاً سُبْحَانَكَ فَقِنَا عَذَابَ النَّارِ﴾ ال عمران/ ١٩١ هەر ئەوەندە بڵێین ﴿لاإله إلاالله، الله أكبر ﴾ هەر ئەوەندەی مرۆڤ یادی خوای بێتە دەمی بڵـێ خوایە تۆ ئەو شتانەت بەبەلاش دروسـت نەكردیـە، پـەروەردگارا لـە ئاگری دۆزەخەمان بپارێزی ،تەماشاكە ئەو ماسیانەی لەناو دەریانـە، باشە كەس فكردەكاتەوە ئەوانە بەچی دەژین .؟ خۆراكیان هەر خـوای گەورە بۆ خۆی ئەیانداتێ، تەماشاكە سەدەف ئەوەی ئەوها دەكرێتەوە مرواری و مەرجانی تێدایە، ساڵێ نۆ ملیۆن هێلكەی دەكا ماسیەكی تر هەیە، ناوی كافیارە ئەو ساڵێ سێ تا چوار ملیۆن هێلكەی دەكـا، ئەوە خواردنی ناو دەریاكانە، خوای گەورە هەر لە خۆیان خواردنی بـۆ دروست كردونە بۆ خۆیان ئەژین ، ژوشكی نـاو ئـاوێ سـاڵێ بیـست ملیۆن هێلكەی دەكا ، كەروێشكی ناو ناوێ هەر جـارێ چـل هـەزار هێلكەی دەكا، ماوەی یەك هەفتـەش بـەردەوام دەبـی تەماشـا ئـەو هەموو مەلایین مەلایینە هەموو خوای گەورە وەی كردوە ئەوانـە بـۆ خۆیان ببنە خۆراكی ئەوانی تر، باشە خۆ ئەگەر ئەوانە هـەموو ببنـێ ئەوە بەیەك ساڵی هەموو دەریاكە دەبێتە یەك جۆرە ئاژەڵ، هـەموو دەبێتە ژوشكی ناو ناوێ، یان دەبنە كەروێشكی ناوێ ، ئەوجا ئەوانە بۆ نموونە چـۆن لەسـەر زەوی كەروێـشك و ژوشـك هەنـە، بەهـەمان شێوەلە ناو ناوێش جۆری ماسیەكان ناویان لێ نراوە .دەی تەماشـا

ئەوانە بە هەموویان نزیکەی هـەزار دوو هـەزاریان ببتـێ، بـاقی تـر هەموویان دەبنە خـۆراکی یـەکتری، ئـەوە وەدیهێنـەر!.. باشـەتوخوا ڕۆژێك ئێوە فکر تان کردۆتەوە، ئەوانە کێ دەیان ژیێنی، ئەوانە کـێ نانیان دەداتن، کێ ئاویان دەداتـن .؟ نموونەیـەکی ترلـەناو جەرگـەی دەریا تاریکستانە چاو چـاوی نـابینی، باشـە ئـەی ئـەو ماسـیانە چ بکەن، خۆ چاویشیان گلۆپی پێوە نیە، ئەی چ بکەن خوای گەورە ئـەو ماسیانەی کەلە بن بـن ئـاوێ دەژیـن، وەی کـردووە گلـۆپی لـە بـۆ تێیخـستون ئـەوجا گلـۆپ هەیـە، سـۆرە زەردە سـەوزە، پەمبەییـە بنەوشەییە، هەر ماسیەك جـۆری گلـۆپێکی پێوەیـە . هەیـە دووی پێوەیە .هەیە هەموو قەلبی گلۆپە، ئەوجا زۆر جـاران لـە تەلـەفزیۆن ئەو ماسی یە دەبریقێتەوە، کە کاتێك کابرا لایتی لێدا هەموو دەڵێی فسفۆڕە، ، تەماشای عەزمەتی ئـەو وەدیهێنـەر بکـە، واللـە ئێمـە نەماندەزانی ئەوانە چۆن دەژین، خـوا بـۆ خـۆی گلـۆپی بـۆ دروسـت کردوون، لە ناو دەریادا بۆ خۆی تاریکە ﴿**ظُلُمَاتٌ بَعْضُهَا فَوْقَ بَعْضٍ**﴾ (النور:٤٠) تەماشای خـوای گـەورە هەرهـەمووی وەلێکردلۆخۆیـان بژین، یـەکتر ببیـنن ژیـانی خۆیـان بـە سـایەی ئـەو گلۆپانـەی کـە پێوەیتیـان بگـوزەرێنن، زۆر جـاران تۆزوبایـەك دێ، بورکانـەك دێ، دڵمان تەنگ دەبی دەڵێین : واللەهی ئەو تۆزو بایە ناخۆشـە، بۆنموونـە پێرێ باران بوو، پێش بارانێ تۆزوبایەکی سـەیری هێنـا، هـەتا دیـتم

دارەکان بەکۆمەڵ پەڵکی لێدەبۆوە، لەوانەیە کابرا چاوی خۆی دەگری بڕەك ناسوپاسگوزاری دەکا . چیە ئەو تۆزوبایە، چاوم کوێرە بوو کابرای قوڕ بەسەر ڕەبۆی هەیە، پشی تەنگە ئەو ناشوکریان بکا بڵێ وەختە بخنکێم ، بەس سبحان الله لەو کەونەی هیچی بێ ڕەحمەت نیە ..لەمێشەکی هەتا گەورەترین شت هەرهەمووی ڕەحمەتە، لە بۆ مرۆڤ هەرهەمووی ڕەحمەتە . تۆزوبا دوو سوودی زۆر سەیری هەیە یەکەمین : سوودی تۆزوبای ئەوەیە ئەو تۆزە شوعاعی تیشکی ڕۆژێ وەردەگرێ، کاتێك کە ڕۆژ ئاوا دەبی، زەرداتیەکی زۆر جوان پەیدا دەبی ، دەزانن ئەو زەرداتیە چیە .؟ ئەو مەنزەرە جوانە چیە .؟ کە بویتە جێی سەرنجی شاعیرەکان و شیعری بەسەردا بڵێن، ئەوە تیشك دانەوەی ئەو ڕۆژە کە لە ناو تۆزەکەیدایە، ئەوە ڕەنگی تۆزەکەیە کە ڕەنگێکی زۆر جوانی هەیە، کاتژمێرێکە ڕۆژ ئاوا بووە، دەبینی ئەو پارچە زەویە ڕۆژەکەی لێ ئاوا بووە، دەبینی یەك پارچە زەردایی گەلەك جوان و دڵ فڕێنە ئەوە هەمووی بەسای تۆزەکەوەیە ، دووەم : سوودی تۆز کە ئەو باران بارینە، ئەو تۆزو بایە تەبعەن کە باران دەباری هەڵمە، دەچیتە ئاسمانێ ئەوە ئەو هەڵمە، کۆمەڵە هەڵمێك خڕدەبنەوە، چەند زەڕەیەك لەم هەڵمە خڕدەبێتەوە ، دەبێتە باران بەسایەی چی خڕدەبێتەوە .؟ بەسایەی ئەو تۆزوبایەی خڕی دەکاو بەردەبێتەوە ، ئەگەر ئەو تۆزوبایە نەبێ، ئەوانیش یەکتری ناگرنو

تۆش بارانت بۆ نابێ، زەویش سەوز نابێ، ئەو تۆزوبایەکە چاوتی کۆرە دەکرد، ئەو تۆزوبایەی کە پێت ناخۆش بوو، ئەوە دەبی مەمنونی بی، لەبەرەوەی ئەوە بارانت بۆ دێنێتە خوارێ، ئەوە بارانەکەت بۆ خڕدەکاتەوە بۆ ئەوەی ببتە ئاو، دلۆپ دلۆپ بەسەرت دا بباری و مەنفەعەت و خێری لێ ببینی .. بورکان یەك لەو شتانەیە کە مرۆڤ زۆر پێ مشەوەش دەبی، زۆر دڵی پێ نارەحەت دەبی، واللە بورکان یەك لە نیعمەتەکانی خوایە، لەوانەیە بڵێی ماموستا چۆن ڕەحمەتە .؟دەڵێی دۆزەخە کاتێك دەتەقێت وهەڵدەچی دەڕژێتە سەر زەوی، هەرچی بەبەرکەوی دەی توێنێتەوە، کاکی برام : ئەو زەوییە ئەگەر چەند هەزار مەترێك بچیتە خوارێ، لەژێر ئەم زەوییە گەرماتیەکەی ئەوەندە زۆرە، بەردی ئەتوێنێتەوە ئەو گەرماییە زیاد دەبی زیاد دەبی پاڵەپەستۆی غازاتی لێدەدات، ئێ ئەو گەرماتیە دەبی دەربچی، ئەگەرنا زەوی پارچە پارچە دەبی، هەر شارەی بەلایەك دا دەچی و دەڕمێت، ئەو هەموو خەڵکە ماڵی کاول دەبی، ناواللە خوای گەورە ماڵی هە موو خەڵکی خراپ ناکا ، بەڵکو چ دەبی؟ ئەو گەرماتیەو ئەم پاڵەپەستۆیەی غازو ئەو هەموو گەرماییە ڕاست کەلێنێك بۆ خۆی دەبینیتەوەو، لەوێ دەرئەچێ و بۆ وەی باقی خەڵکەکەی تر هەموو ئیسراحات بکاتن . ئەوە نیعمەتی خوایە برام : ئەمە ڕاستە لێی ئەترسێین، بەڵام بشزانە ئەوە ڕەحمەتی خوایە ، بۆ

وەی تۆی مرۆڤ لەسەر زەوی، ژیانت لێ تێك نەچی، ئەگەر دەكەس بە بورِكانەكەی بمری، بەلاّم مەلایین كەس لەبەری ئیسراحات دەكاو لەتەقینەوەیكی گەورە رِزگاری دەبێ، ئەوە عەزەمەتی خوایە ، بانموونەیەكی تر بهێنینەوە، یەك لە زاناكان دەفەرمووێ : لەوانەیە تۆ رِۆژێك بپرسی باشە چۆلەكەو كۆتر ئەگەر باڵی پێوە نەبایە چ دەبوو، یا وەكو ئاژەڵەكانی سەر زەوی بژیابایەو نەچوبایە ئاسمانێ، خۆلە ئاسمانێ چ نیە وانیە . .؟ لە ئاسمانێ نەگەنم هەیە نەجۆ هەیە، هەر دێ لە زەوی دەخوا ئەدی فرِینەكەی لە چیە .؟ بزانە چەند جوان وەلاّم دەداتەوە دەڵێ : بابەگیان ئەگەر هەموو تەیروباڵندەكان باڵیان پێوە نەبایە، دەبوو لە سەر زەوی بن، وەیە یان نا .؟ لە زەوی بانە دەبایە چ بخۆن .؟ دەبایە ئەو كرمانە بەبەردوام بخۆن كە لە ناو زەویەكانن كەكرمەكانی ناو زەویان خوارد، ئەوا كارێك رِوونادات، بۆ ئەو زەویە كیمیاو پەینی خۆی زیاد كاو ژینگە زیاد ببیتن ، كە ئەمەش رِوونەدا زەوی سەوز نەدەبوو، چ دەبی؟ ئاژەڵ دەمری، ئینسانیش مرۆڤیش لەدوای وان دەمرێت، دەی كەواتە ئەی مرۆڤ تەنها مانی تۆ لەسەر یەك باڵی چۆلەكەی رِاوەستایە، ئەگەر باڵی پێوە نەبایە ئەوە كرمەكانی دەخوارد، كە كرمەكانی ناو زەوی بخواردبایە گیا نەدەرِوا، كەگیا نەرِوا گیانەوەر دەمردن كە گیانەوەریش مردن، تۆش خۆ بەتەنیا ناژی، خۆ بەتەنها بۆ خۆت نەرِوای، ئەتۆش لەگەڵ ئەو

خەڵکەی سەرت دەناوە لەگەڵ ئاژەڵ و دارەکان دەمردی و دەبڕایــەوە، تەماشاکە، ڕۆژێك فکرمان کردوتەوە ئەی "عظیم" ئەی "خـالق" ئەوانە هەر هەمووی تەواوکــەری یــەکن، ئــەو هــەموو کەونــە وەکــو تەسبیح لەبــچوکترین ئاژەڵێــك تــا گــەورەترین ئەستێرە، هــەمووی تەواوکەری یــەکترن، هــیچ زیــاد نیــە پێــشکەیەك زیــاد نیــە، پــیس پیسۆکێك زیاد نیە، هیچ ئاژەڵێك کــە دەیبیــنین لــە حیکمەتەکــەی ناگەین زیاد نیە، بەخوای خزمەتی تۆ دەکا هــەمووی خزمــەتی ئــەو مرۆڤە سەرکەشە دەکەن کە خوای گەورە ناناسیتن، ئەو ئەستێرەو ئەو ڕۆژە گەورەت دیــوە، خزمــەتکاری تــووە، ئــەو ڕۆژە گــەورە ڕۆژێــك نەیگوت : خوایە ماندووبووم پسام ئەوە من یەك ملیۆن ساڵە هەڵدێم دەڵێی لــێم گــەڕێ دوو ڕۆژان مۆڵــەتم بــدە، نیــە بــۆ .؟ لەبــەرەوەی بەمرۆڤەکان سەر زەوی، چاوەڕوانی ڕۆژ دەکــەن، لەبــەرەوەی مرۆڤــی سەر زەوی پێویستیان بە ڕوناکی هەیە، پێویستیان بە گەرمایی هەیە ئەی ڕۆژ هەتا دەمری، دەبی ئاوا ئیش بکەی، وخزمــەتکاری بــەمرۆڤ بی، باشە تەماشاکە بزانە خوای گەورە چ دەفەرمووی : لە قورئان بــا ئەو ئایەتەتان بۆ بخوێنمەوە خوای گەورە ئەفەرموێتن ﴿قُلْ أَرَأَيْتُمْ إِن جَعَلَ اللَّهُ عَلَيْكُمُ اللَّيْلَ سَرْمَدًا إِلَى يَوْمِ الْقِيَامَةِ مَــنْ إِلَــهٌ غَيْــرُ اللَّــهِ يَأْتِيكُم بِضِيَاء أَفَلا تَــسْمَعُونَ﴾ القــصص/٧١. ئــەو ئایەتــە عــەزیمــەی تەماشاکەن، دەفەرموێتن ﴿قــل أرایــتم ﴾ واتــا فکربکــەوە بەچــاوی

خۆتان تەماشاکەن ﴿إِن جَعَلَ اللَّهُ عَلَيْكُمُ اللَّيْلَ سَرْمَدًا إِلَى يَوْمِ الْقِيَامَةِ ﴾ ئەگەر خوا وەبکا بەردەوام شەو بی، هەتا ڕۆژی زیندبوونەوە هەر شەو بی، ئێ باشە کێ هەیە ڕوناکیمان بۆ بینی .؟ کێ دەوێری بچی ڕوناکی بینی ....؟؟؟؟

ڕۆژ بە قسەی خوا دێت و ڕوناکیمان دەداتێ، بەخوای ڕۆژ بڕوات بە هەمووبوونەوەر نایێتەوە، ئیلا بە زاتی پاکی "اللە " نەبی، ئینجا بۆیە خوای گەورە دەفەرموویێ :﴿ أفلا تسمعون ﴾ ئێوە عاقڵ نابن ئێوە ژیری پەیدا ناکەن . تەنها ئەگەر ڕۆژ بڕوا نەێتەوە، کێ هەیە ڕۆژتان بۆ بهێنێتەوە ، تەبعەن ئەگەر بەردەوام شەو بی ژیانمان تاڵ دەبی ، تەماشا ئەوانەی لە قوتبی باکورو باشور دەژین، لەوێدا شەش مانگ ڕۆژەو شەش مانگ شەوە، بزانن چ ژیانێکیان هەیە، واللەهی ژیان نییە، کاتێك دێیە ئەو شوێنانە ڕۆژو شەو وەکو یەکە، ئەوجا نازونیعمەتی ژیان دەزانی چەند خۆشە ، دووەم : لە پاشان خوای گەورە ئەفەرموویێ : ﴿قُلْ أَرَأَيْتُمْ إِن جَعَلَ اللَّهُ عَلَيْكُمُ النَّهَارَ سَرْمَدًا إِلَى يَوْمِ الْقِيَامَةِ مَنْ إِلَهٌ غَيْرُ اللَّهِ يَأْتِيكُم بِلَيْلٍ تَسْكُنُونَ فِيهِ أَفَلَا تُبْصِرُونَ﴾ القصص:٧٢ دەفەرمووێ : باشە ئەگەر بێتوو ڕۆژهەڵبێ وئاوا نەبێ‌هەتا ڕۆژی زیندووبوونەوە هەر ڕۆژ بی، کێتان هەیە بتوانی شەوتان بۆ بینی .؟ چ شەوێك کە تیدا ئیسراحات بکەن ﴿تسكنون فیه ﴾ چونکە واللەهی ئەوانەی کە لە کارگەی جگەرەو هەندێ

فەرمانگە هەیە، کاتی خۆی دەوامیـان بـەردەوام بـوو، ئەوانـەی کـە بەشەو کاریـان دەکـرد بـە ڕۆژ ئەگـەر دوانـزە کاتـژمێر بنوسـتبانە، تـەعویزی ئـەو شـەش کاتـژمێر شـەوێیان نـەدەکردەوە، هـەرگیز تەعویزنابتەوە نوستنی شەوێ هی ڕۆژ تەعویزی ناکا ، بۆیـە خـوای گەورە دەفەرموویێ :﴿ يأتيكم بليل تسكنون فيه ﴾ خۆشـترین نوسـتن ئەوەیە لە شەو دابێ، باشە کێ هەیە شـەوت بـۆ بینـیتێ بـۆ ئـەوەی ئیسراحات تێدا بکـەیت ﴿أفـلا تبـصرون ﴾ ئایـا ئێـوە نـابینن .؟ فکرناکەنەوە .؟ جا سبحان الله یەك لە زانا ڕووسیەکان بێ باوەڕیـشە گومڕاشە چوو بۆ ئاسمان گوتی : یەك شت سەری سوڕماندم لە ئاسمـان ئەویش ئەوەیە لەناکاو شەو دادێ ، شەوێکی زۆر زۆر تاریکیش لـەپڕ ڕوناکیش هەڵدێ ، بەڵام لای ئیمە وانیە، ئیمە هێدی هێدی بە کـاتی خـۆی دەڕوا ، کـابرا دەڵـێ : ڕۆژ نیوکاتـژمێر مـاوە ئـاوا بـێ زوو بگەمەوە ماڵێ . باشە ئەگەر لەپڕ ئاوا بایە، هەموو ژیانمان لـێ تـاڵ دەبوو، ئەوە نیعمەتی خوایە، ئـەوە عـەزەمـەتی خوایـە یـەك، دووەم خۆر، بەرێك‌و پێکی خۆی، بە هێواشی، خۆی ئاوا دەبـێ ، لـەپڕ ڕۆژ هەڵنایێ، لەپڕ ڕۆژ ئاوا نابێ، بـۆ ئـەوەی تـۆ بتـوانی هەڵـسوکەوت لەگەڵ ئەو ژیانەی بکەی ، بـەڵێ برایـەکان : ئـەوها فکرکەنـەوە لـە عـەزەمەتی خوا، ئەوە شتێکی سادە بوو، ئێـوە حـەق وایـە بگـەڕێن بسوڕێن،تەنها تەماشای دونیایێ بکـەن ، بۆیـە یـەك لـە هـاوەڵانی

پێغەمبەری (ﷺ) دەیفەرموو : ئەگەر پێغەمبەر قسەی بکردبایە زیکر بوو " وکان صمته فکر " ئەگەر بێ دەنگیش بوایە ئیلا فکری لە عەزەمەتی خوا دەکردەوە، ئێوەش کە دەڕۆن دەچنە بازاڕ، دەچنە دەشتێ، دەچنە جێیان، دەچنە سەر شینایی، کوڕە تەماشای عەزەمەتی خوای بکەن، ئەو هەموو مەخلوقانەی خوای چەند جوانی دروست کردوە .چەند ڕێك وپێکی دروست کردوە .ئا لەو کاتەدا تۆ لەگەل بوونەوەر ئەبیتە یەك بەش، لەبەرئەوەی ئەو بونەوەرە هەرهەمووی گوێڕایەڵی "رب العالمین " دەکا، تۆش فکرت لەوان کردەوەو لەگەڵ ئەوان تێکەڵ بووی، تۆش لەگەڵ وان یەك تەسبیحات دەکەن کە دەفەرمووێ :﴿ **رَبَّنَا مَا خَلَقْتَ هَذا بَاطِلاً سُبْحَانَكَ فَقِنَا عَذَابَ النَّارِ﴾** ال عمران: ١٩٦جا ئەگەر ئێمە ئاوامان کرد بەو شێوە فکرمان لەعەزەمەتی خوای گەورە کردەوە ، یەکسەر دڵتەنگیمان بۆ دروست دەبی، دڵتەنگیەکە چیە .؟ ترسی خوایە ، بەراستی مرۆڤ لەخوا دەترسێ لەبەرچی .؟ چونکە دەزانی ئەو خوایە زۆر عەزیمە زۆر بەهێزو وبالاَ دەستە، یەك خولەك زەوی بلەرزی هەرهەموومان هیچمان پێ ناکرێ، دە ئەوە عەزەمەتی خوایە، ئەوە قودرەتی خوایە کە هەموو ساڵ یادوو ساڵ جارێك، هەتا ئەو ماوانەش " زلزال " ساڵێ زەوییەك لەرزیوەولە دوو سێ جێیان لەرزیوە، کاکە بەهەزاران خەڵکی کوشتیە، هەموو خەڵکی ڕادەکەنە دەرێ، نازانن بۆ کێ بچن، چونکە

ئـەو زەوییـە چـێوەی نیـە دەسـتی پێـوە بگـری، خـۆت بـەدیواری بەعامودی ناتوانی بگری، هەرهەڵدێی هیچیشت لـە دەسـت نایـێ ، ئەوە عەزەمەتی خوایە ،برام . بەیەك لەرزینی زەوی ئەو مرۆڤە ئـاوا سامگر دەبێ و دەمی قەپات دەبی وناتوانی هیچ بکا بەرامبـەر ئـەو خوایەی ، دە مادام تۆ ئەوەندە لاوازی بەرامبـەر بـەخوا، هـەق نیـە توخوا لێی بترسێی، هەم ئەو پەڕی خۆشەویستیشت بۆ دروست ببیتن، کاتێك کە خۆشەویستیشت بـۆ دروسـت بـوو، ترسـی خـوات لـە بـۆ دروست بوو یەکسەر گەڵاکانی حـەیا دروسـت دەبـی، دەزانـی شـەرم واتای چیە .؟ واتـە هەسـت پێدەکـەی ئـەو بوونـەوەرە هەرهـەمووی تەسبیحاتی خوای گەورە دەکا ، تەنها تۆ بـێ ئاگـای لـەو بونـەوەری خوای گەورە دەفەرموویتن : ئەوەی لەو بوونەوەردا هەیە هەرهەمووی تەسبیحاتی دەکەن ، دەفـەرمووی: ﴿ولکـن لاتفقهـون تـسبیحهم ﴾ الاسراء :٤٤، بەڵام ئێوە لە تەسبیحات وزیکری ئەوانە ناگـەن .. دار زیکری خوا دەکا ، بەرد زیکری خوا دەکا ، جا بـەردە دارە هـەمووی زیکری خوای دەکەن . تەنها تۆ بێ ئاگای، ئاگـات لـە خـوای نیـە ، توخوا مرۆڤ کاتێك فکردەکاتەوە بەردێك یادی خوای دەکا، دارمیـوە دارسێوە یادی خوای دەکا، توخوا حەیف نیـە شـەرم نیـە ئـەمن بـێ دەنگ بم، ناوالله شەرمە مـرۆڤ حـەیا دەیگـرێو لەگـەڵ وان ئـەویش دەست بە زیکری خوا دەکاو لەگەڵ وانیش گوێڕایەڵی "رب العـالمین "

دەکاتن، کە ئابرووەکە دروست بوو، ئەوجارە بەرهەم دروست دەبی، تامی ئەو شتەی چیە .؟ پەرستشی خوایە تاعەتێکی ڕێك، پەرستشێك کە بیناغە کرا بی لەسەر خۆشەویستی ، تاعەتێك کە واجیباتەکان زۆر بە جوانی ئەدا بکەم ، ئەو کاتە خواپەرستی، واللەهی مەلابانگ دەدا ئۆتوماتیکیەن دەچی نوێژ دەکەی، ناتوانی دوای بخەی، خوای گەورە هەر شتێکی پێ سپاردبی، یەکسەر بە خۆت دەیکەی ناتوانی نەیکەی، لەبەرئەوەی گیانت لەسەر خۆشەویستی خوای گەورە دروست بوو لەسەر ناسینی خوای گەورە دروست بوو، لەسەر ترسی خوای گەورە دروست بوو، لەسەر شەرم دروست بوو، لەسەر هەموو خواپەرستیەکانی زۆر ڕێك وپێك دەبی ، جا بۆ ئەوەی ئەو دارە وشك نەبی چیە .؟ دەبی بە زیکر ئاوی بدەی، بۆ ئەوەی ئەو دارە نەڕزێ ، لەناو دڵت دەبێ بە زیکر ئاوی بدەی . دەبێ هەردەم زیکر بکەی، دەبێ هەوڵ بدەی هەموو کاتێکت هەموو ساتێکت جولانەوەیەکی، جلك لەبەر دەکەی، جلك لەبەرت دادەکەنی، دەچیە بازاڕ، دێیەوە، هەتا دەچیە پێشاو دێیەوە، هەرهەموو ئەوانەت بەزیکر بێتن، ئالەو کاتەدا بەکردارەکی داری خۆشەویستی ڕۆژ بە ڕۆژ قەڵەو تر دەبی، ڕۆژ بە ڕۆژ ڕێك وپێك تر دەبی، کە ئاوات کرد کە ئەوها ڕێك وپێك بووی وبەو زیکرانە ئاوت دا، واللەهی ئیشتیاقی خوای گەورەت لۆ پەیدا دەبی ، واللەهی حەزدەکەی بە زووترین کات

بەعەزەمەتی " رب العالمین " بگەی تەماشاکە یەك لە هاوەڵەکانی پێغەمبەر (ﷺ) ناوی {حەرامی کوری مەلحام } بوو کاتێك تیرێکی لێ درا، ئێمە ئەگەر تیرێك یان شتێکمان پێبکەوێ، دەکەینە ئاخ وئۆفە ئۆف. ئەو فەرمووی : ﴿فزت و رب الكعبة ﴾ تەماشاکە کابرا تیری پێکەوتیە ئەوجا بێ باوەڕەکەش دەگێڕتەوە دەڵێ : واللەی تیرەکەم لەپشتی دا، لەسینگی نوکی دەرچوو، کە بەربۆوە گوتم : دەبێ چی بڵێ دەبینم هاوار دەکا . دەڵێ : بردمەوە بەخوای کعبە، لەبەرچی بردیەوە .؟ لەبەرەوەی بەخوای خۆی گەیشت، ئەوەندە تامەزرۆی خوای بوو، ئەوەندە خۆشەویستی خوای لە دڵدا بوو، تەمەنای دەکرد زوو زوو بگا بەخوای گەورە، مادام کابرای بێ باوەڕ لێیداو شەهیدی کرد پەڕاندیەوە بۆ ئەو دەرگایەی کە مردنە، ئەویش ببڕی بەرەو زاتی پاکی " الله " بڕوا. بیلال لەسەر ڕوح دانێ بوو، ژنەکەی دەیگوت : هاوار لەخۆمان هاوار موسیبەتە . گوتی : وامەڵێ بەڵکو بڵێ "وافرحتاه " خۆشی لە بۆ خۆمان ﴿ غدا القى محمدا وصحبه﴾ گوتی : تۆ چی دەڵێی ئافرەت؟ بڵێ هاوار لەخۆشی، بڵێ هاوار لەو ڕۆژەی لە هەموو ڕۆژەکان کەیف خۆشترم، لەبەرەوەی بەیانی بەخۆشەویستەکانم دەگەم! برام : بەو دارەی گوتمان : ئەو تامەزرۆیە بەودارەی پەیدا دەبێتن ، پێغەمبەر (ﷺ) گوتیە : هاوەڵەکان خۆتان حازر بکەن بۆ غەزا باوك وکوڕێك، باب دەیگوت :

من دەچم، کوڕ دەیگوت من دەچم ، باوك: کوڕە کوڕم شوورەییە لە تۆ گەورەترم، کوڕەش دەیگوت، واللەهی بابە ئەوە بەهەشتە ، قەیناکە گوتیان : قورعەی دەکەین، ڕاست ناوی کوڕەکەی دەرچوو ڕای کرد . باب گوتی : وەرە کوڕم ئەمن بابتم، فەرمانت پێدەکەم بگەڕێوە ، گوتی بابە هەرچی دەڵێی حازرم، تەنها ئەوە دیتنی خوای گەورەی تێدایە، ئەوە خۆشی بەهەشتی تێدایە، لە بۆ دیتنی پێغەمبەری (ﷺ) بە چ ئەو تامەزرۆیە دروست دەبی، بەو خۆشەویستی کە گوتمان ، بەڵێ . هەتا هاوەڵ هەبووە لە کاتی غەزوە دەیویست دووسێ دەنکە خورمای بخوا، ئینجا بڕواتە شەڕێ گوتی : فڕێیدە فڕێیدە هەتا ئەو خورمایەی دەخۆم وقوتی دەدەم چەند خولەکێك درێژە دەخاێنی لە ژیانم، هەتا بەخزمەت خوای خۆم بگەم، ڕاست فڕێیدەداو بەڕاکردن بۆ دوژمن چوو، هەتا شەهید بی ، عیکرمەی کوری ئەبوجەهل لەشەڕێکدا وابزانم . شەڕی نەهاوەند بوو، دەیگوتە : هاوەڵەکان " من یبا یعني علی الموت " کێ بەیعەم لەگەڵ دەکا، پەیمانی مردنم لەگەڵ ببەستێ، بۆ .؟ ئەوەندە تامەزرۆ بوون بەپێغەمبەر ی خوا (ﷺ) بگەن، بۆیە دەیگوت : وەرن پەیمانی مردنم لەگەڵ ببەستن یەکسەر دەچین ناگەڕێینەوە، هەتا ئەوجارەی بەخزمەت پێغەمبەری خوا دەگەین (ﷺ)، ئەوە نمونەی ئەو کەسانەیە کە تامەزرۆی بینینی خوا، خۆشەویستی خوا لە دڵی

دابوون، هەموو کاتێکیش حازر بوون بە زووترین کات بەخزمەت " رب العالمین " بگەن، ئەگەرمرۆڤ ئەوهای کرد پاش ئەو هەموانەش یەك دڵسۆزی بۆ دروست دەبێ، هیچ شتێك لەو کەونە کاریگەری لێناکا ، هەموو غەمی چیە .؟ بەس ڕەزامەندی خوایە . گرنگ ئەوەیە خوا لێی ڕازی بی، نەشەیتان نە ڕیبا نە شەهوەت هیچ هیچ شتێك ناتوانی کاریگەری لە دڵ ودەروونی بکا ، کە ئەو دڵسۆزیەی بۆ دروست بوو، منەتی بەوەی نیە کە پارەی ناداتێ، ئەوە لێی ڕازی دەبی، ئەوە قسەی پێ خۆش نیە . بانموونەیەکتان بۆ بگێڕمەوە، یەك لە خولە فایەکان قەسرێکی زۆر گەورەی دروست کرد، حەسەنی بەسریشی دەعوەت کرد، خەڵکێکی زۆری دەعوەت کرد حەسەنی بەسریش نۆرەی هات قسەی بکا لەکاتی قسەکەی دا خەلیفەکەی زۆر شکاندەوە، بۆ وەی بزانی خەلیفە مەغرور بووە، مافی خەڵکی لەبیرکردوە پارەکانی هەموو بەقەسرو کەرپوچ دایەو لەسەر یەکی دانایە، خەلیفە بڕیاری دا گوتی : دەیکوژم، وەزیرەکان خڕبوونەوە گوتیان : ئەتۆی شکاندەوە . گوتی : دە بەقورئان دەیکوژم . واللە گوتیە جەندرمەکانی بڕۆن بیگرن . حەسەنی بەسریان گرتوو هێنایان لەسێدارەی بدەن، تەبعەن عادەتی وابوو فەرشەکیان ڕادەخست، فەرشەکە لەپیستەی بوو، بۆ ئوەی کە لەسەری دەدەن، خوێنەکە نەڕژێتە سەر مینبەری خەلیفە، بپرژێتە سەر پیستەکەی وپاشان

هەڵی گرن و بیبەن، حەسەنی بەسریان برد، حەسەنی بەسری کە هاتە ژووری یەك نزای کرد، کە نزای کرد هاتە ژوری " السلام علیکم " خەلیفە هەڵسایەوە " وعلیك السلام " فەرموو فەرموو گوتی : وەرە ئەلێرە دانیشە، حەسەنی بەسری لە تەنیشتە خۆی داناو پرسیاری دینی لێ دەکرد . زۆریان پێ سەیر بوو، خەلیفە پێش دووسێ دەقە هەڕەشەوگوڕەشەی دەکرد دەیگوتە : جەلادەکەی وای لێبدا یەکسەر ڕوحی دەربچێ، ئەوە چیە .؟ زەوی‌و ئاسمان فەرقی کردیە وگۆڕاوە نەیانزانی مەسەلە چیە .؟ یەك لەگەڵ حەسەنی بەسری چووە دەرێ گوتی : قوربان ئەوە چت کرد . گوتی : واللەی یەك نزام کرد، یەکسەر خوای گەورە گۆڕی . گوتی : ئەو نزایە فێری منیش بکە، ئەو نزایە بوو کە حەسەنی بەسری دەفەرمووێ : " یاولي نعمتي وملاذي عند کر بتي إجعل نقمته بردا وسلاما کما جعلت النار بردا وسلاما علی إبراهیم " پاڕاوە لە خوای گوتی : ئەی ئەو خودایەی کەوا خاوەنی هەموو نازونیعمەتەکانە کە بە منی بەخشیوە ، ئەی ئەو خودایەی رزگارم دەکا لە هەموو ناخۆشیەك ، خوایە ئەو توڕە بونەی ئەو وەبکە ساغ وسەلامەت بم، چۆن ئەگەر حەزرەتی ئیبراهیم یان هاویشتە ناو ئاگری بەساغ وسەلامەتی دەرچوو، ئەوهاش من دەربچووێنە، خوای گەورە نزایەکەی گیرا کرد، ئەوە بەو دڵسۆزییەوە بەو عەشقەو بەو خۆشەویستیە کە لە دڵی بوو، بۆیێ کاتێك کە نزای

کرد یەکسەر " رب العالمین " لێی قبوڵ کرد ، چەند خاڵێکم ماوە بەخێرایی پێتان دەڵێم : چونکە دەبێ کۆتایی بەو بابەتە بینم بێینە سەر بابەتێکی تر، لە مەسەلەکەی ئەویش هەندێ شت هەنە ئەو شتانە دەبنە هۆکار خۆشەویستیەکە زۆر بەهێز ببی:

**یەکەمین شت:** " إتباع السنه " یەعنی پێغەمبەری خوا چی کردیە ئەتووش وا بکەی، خوای گەورە دەفەرمووێت : ﴿**قُلْ إِن كُنتُمْ تُحِبُّونَ اللَّهَ فَاتَّبِعُونِي يُحْبِبْكُمُ اللَّهُ**﴾ ال عمران:٣١ ئەی خەڵکینە خوای گەورە دەفەرمووێ : پێیان بڵێ یامحمد (ﷺ) ئەگەر ئەوانە دەڵێن : خوامان خۆشدەوێ با بە دوای محمد کەون، ئەوکات خوای گەورە خۆشیانیشی دەوێ لە گوناهەکانیشیان خۆشدەبی، ئەحمدی کوری حەنبەل ڕۆژێکیان لەگەڵ کۆمەڵێك لە برادەرەکانی چوونە سەر دەریا خۆ بشۆن، لە دیجلەی خۆیان هاویشتە ناو ئاوێ، ئەو خۆی ڕووت نەکردەوە گوتیان : یائیمام بۆ خۆت ڕووت ناکەیتەوە؟ گوتی : واللەهی فەرموودەیەکی پێغەمبەریم بەبیر هاتەوە (ﷺ) کەوا نەهی کردوە مرۆڤ لەهەموو شوێنێك خۆی ڕووت بکاتەوە، خەڵك لاشەی ببینیت ئەوەی گوتوو چووە ماڵێ، شەوێ حەزرەتی جبرائیلی هاتە خەونی گوتی : ئەی احمد خوای گەورە لە هەموو گوناهەکانت خۆش بوو، خۆشەویستی خۆشی لەناو دڵت چەقاند، لەبەرئەوەی سوننەتەکی پێغەمبەریت جێبەجێ کردیە، هەر ئەو ئیمام ئەحمدە بوو هەتا مرد

نەیدەزانی كاڵەك چۆن بخوا دەیانگوت : بۆ ناخۆی .؟ دەیگوت : ئاخر بۆم ساغ نەبویتەوە ئاخۆ پێغەمبەر بەپەلكەوەی دەخـوارد یـان سـپی دەكرد، ئیلاّ دەبی ساغ ببیتـەوە ئینجـا دەیخـۆم، سـبحان اللـه ئـەو ئیمامە بە دواكەوتنی سونەت گەیشتە ئەو پلەیەی خۆی ، بـرام دەبـا ئێمەش سونەتەكان جێبەجێ بكەین: ئەو سوننەتانەی پێمـان دەكـرێ، چونكە پێغەمبەر دەفەرمووێ: " فما امرتكم به من شيء فأتوا منـه ما اسـتطعتم " ئەگەر من ئەمرم بەشتێك كرد، هەتا تواناتـان هەیـە بیكەن، كوڕە دەبا ئەوانەی ئیمكانیەتمان هەیـە دەبـا ڕیـشەكی وەكـو پێغەمبەری (ﷺ) بەربدەینەوە، دەبا بتـوانین سـیواك بـەكار بێـنین، دەبا بتوانین زۆر سەلام لە یەكتر بكەین، بەپێی ڕاستە بـچینە ژوورێ، بەپێی چەپە بێینە دەرێ ، ئەو زیكرو ئەورادانەی كـە پێغەمبـەر بـۆ ئێمەی دانایە هەر هەمووی تەتبیق بكەین، ئـەو دارەی خۆشەویـستی بەهێز دەكەی، وەكو پەین كە لەبن داری دەكەی.

**دووەمین شت** : خوێندنەوەی قورئانی پیرۆز زۆر زۆر گرنگە بـرام . چونكە مادام تۆ خۆشەویستی خـوات لـە دڵـە، دەبـی خۆشەویـستی قسەكەت زۆر زۆر لـە دڵـی بـی، بـەڵام بەداخـەوە دەڵـێم : مـانگی ڕەمەزان مـانگی ختمـە، مـانگی ئەوەیـە تـۆ لەگـەڵ خـوای خـۆت تێكەڵاویی ، دەست بەقورئان بكـەی و بـۆ خـۆت ختمـەكی بكـەی و خێروخێراتێك حاسڵ بكـەی، بـەڵام ئێمـە شـەوان لـەجیاتی قورئـان

خوێندن دەبێتە سێنی سێنیانێ . توخـوا حـەیف نیـە، ئـەو تەمەنـە جوانەی بچی لەسێنی سێنیانێ ببیەتە سەرێ، توخوا حەیف نیـە، تـۆ بچی دۆمینانێ بکەی، بچی لـەبن دیـواران دانیـشی هـەتا کاتـژمێر دوانزەی شەوێ، لە قسەی زیادەو وغەیبەت وبینەوبەردە والله حەیفە، بەخوای ئەو تەمەنە هەمووی بەفیڕۆ دەڕوا، پێغەمبـەری خـوا (ﷺ) دەفەرمووێ: ئەهلی بەهەشت لە هیچ پەشـیمان نینـە، لەیـەك شـتی پەشیمانن، چیە .؟ ئەو کاتەی هەندێك لەتەمەنیان ڕۆیشتیە بەزایەع، گوێڕایـەڵی خوایـان تێـدا نەکردیـە، ئـەوە پەشـیمانیە پێغەمبـەر ئەفەرمووێ : هەر دانیشتنێك ئەگەر یادی خوای تێـدا نـەکرێ، ڕۆژی دوایی پەنجە گەزین و پەشیمانیە، توخوا حەیف نیە بچین ئەو تەمەنـە جوانەی خۆمان لەناو منداڵ وتـواران لـەگازینۆیان لـە یانـان ببەینـە سەرێ ، ئەم ڕەمەزانە موبارەکەش کە مانگی قورئانـە، قورئانەکـەی تێدا تەرك کەین.

**سێیەم شت** : نەوافیڵ بکەین یەعنی سـونەتی پێغەمبـەری خـوا (ﷺ) جێ بەجێ بکەین، لەبەر ئەوەی فەرموودەیەکی قودسی هەیـە دەفەرمووێتن : خوای گەورە دەڵێ عەبد زۆر لـەمن نزیـك دەبیتـەوە ، بەچی .؟ بەونوێژانەی لەسەرم فـەرزکردن ﴿لایـزال یتقـرب إلـي حتـی أحبـه ﴾ دەفـەرمووێتن : لـەمن نزیـك دەبتـەوە بەنـەوافیڵ یـەعنی بەسوننەت، جا چ ڕۆژی بی چ نوێژەکان بی هـەتا خۆشـدەوێ، خـوای

گەورە دەفەرمووێ : کە خۆشم ویست دەبمە چاوی کە دەیبینی، دەبمە دەستی کە ئیشی پێیە، دەبمە دەمی کە قسەی پێ دەکا ، واتە خوای گەورە ئاوا نێزیك دەبتەوە، هەر کەسێکیش خوا خۆشی بوێ یەکسەر بانگی جبرائیلی دەکا ، دەفەرمووێ : ئەی جبرائیل وەرە، من فلانی کوری فلانم خۆشدەوێ، بەهەموو فریشتەکانی ئاسمانێ بلێ، خوای گەورە فلانی خۆشدەوێ، توخوا ئەوە خۆشترین خەلآت نیە .؟ توخوا ئەوە گەورەترین فەخر نیە، کە خوای گەورە بانگی جبرائیلی بکا، بلێ من فلانی کوڕی فلانیم خۆشدەوێ . گەورەترین نیعمەتە، خوای گەورە باسی تۆ بکا، کوڕە بەسە بەقورئان، خوا باسی تۆ بکا بلێ فلانی کوڕی فلانم خۆشدەوێ، بڕۆ بلێ مەلائیکەتەکان هەمووتان خۆشتان بوێ، ئەو خۆشەویستیە دێتە سەر زەویش، بەخۆشت نازانی بۆ فلان وفیسارت خۆشدەوێ، کە لەشەقامی دەیبینی دڵت بۆی دەچی خۆشت دەوێ، خوا واجبی کردیە ئەو کەسەی خۆشبوێ "والعکس بالعکس" ئەگەر خوای گەورە ڕکی لەتۆ ببیتەوە، غەزەبی لە تۆ هەستی بانگی جبرائیلی دەکا دەڵێ : من رقم لە فلانی کوڕی فلان دەبتەوە، قوڕ بەسەر ئەو کەسەی خوای گەورە باسی بکا بە رقلێبونەوە، ماڵ کاولی لەبۆ ئەو کەسەی خوای گەورە بلێ رکم لە فلانی کوڕی فلان دەبێتەوە، دەلێتە فریشتەکانیش ئێوەش رکتان لێ بێتەوە، پاشان ئەو رك

لێبونەوەیە دەچێتە دڵـی ئـەوەی ئـادەمیش لەسـەر زەویـش دابـەش دەکرێ .

**چوارەمین شت** : ناسینی خوای بە چ .؟ بە نـاو و خاسـیەتەکانی، زۆر فکر لە ناوەکانی خوای گەورە بکەوە، لە ڕوانگەی ناوەکانی خوا، عەزەمەتی خوای گەورەت بۆ بەدەردەکـەوی، یـەك نموونـە دەهێـنم : ئەگەرچـی سەریـشتان دێـشینم گـەردنم ئازاکـەن، ئـیتر دەمـەوێ بابەتەکەی بگۆڕین یەك نمونە دینمـەوە لـە سـەر رزق، چـونکە هـەر ناوێکی خوای گەورە لەو کەونەدا ڕەنگ دەداتەوە، بابزانین "الـرزاق " لـەکوێ رەنـگ دەداتـەوە، نەوعـە تیمـساحێك هەیـە زۆر جـار لەتەلـەفیزیۆنی پیـشانی دەدا، لـە وانەیـە دیتبتـان ئـەو تیمـساحە زەبەلاحە ماسی دەخوا، لەبەر زەبەلاحی خـۆی ماسـی پـێ نـاگیرێ، بەماسی بچوك دڵـی داناکـەوێ، ماسـی گـەورە نـەبی گـەدەی بـەو ماسییە وردانە تێر ناخوا ، نەوعە چۆلەکەیەکی بـچوکی خـڕ هەیـە، ئەویش گۆشت خۆرە لەبەر بچوکی خۆی ئەویش ماسـی پـێ نـاگیرێ، خوای گەورە لەبەرئەوەی " الـرزاق "ە ئـەو دووە پـەیمانێك دەبەسـتن دەڵێن : وەرە با ئێمە پێك بێین، ئەوها ئەبی لەبرسان دەمـرین، ئـەتۆ بەزەبەلاحی خۆت، منیش بەلاوازی خۆم، وەرە باپێك بێین، چـبکەین دەڵێ : وەرە باپێکەوە ڕاو بکەین . ئێ کـوڕە چـۆن دەبـی ئـەتۆڕمان پێیە، ئەهیچ شتەکمان پێیە، چۆن پێکەوە ڕاو بکەین دەڵێ : ڕاوەستە

ئێستا تەگبیرەکت بۆ دەکەم ، چـۆلەکەکە بـەزمانی حـاڵ، دەڵـێ تـۆ دەمت لەناوئاوێ بکەوە، چاوی خۆت بنوقێنە، تیمساح کاتێك دەنوی چاوی دادەخاتو دەمی دەکاتەوە، هەروەك خەوی لێ کەتیە ئەمنیش دێمە سەرکەپوت، چاودێری ناو دەمی تیمـساحەکە دەکـەم ، ماسـی کاتێك بزانن نوستیە بەبێ ترس دێن ودەچـن، هـەرکاتێك ماسـیەکی قەڵەو هات ئەتوو دندوکێك لەکەپوی من بـدە، بڵـێ دەمـت قـەپات بکەو هەقت نەبی دەی ئەو ماسیە دێو ئـەوە دەڕوا، هـەتا یـەکێکی قەڵەودێو ئەویش یەك دندوکی لەکـەپوی دەداو ئـەویش دەوی خـۆی قەپات دەکاتەوە، ماسیەکەی دەخوا هەمووی دەخوا، پێکهاتەکـە بـە خۆی نیوە بە نیوە بوو، بەڵام غەدری لێکردو هەمووی خوارد . باشـە ئەدی بەشی ئەو چۆلەکەی ، دەمی خۆی بۆ بەش دەکاتەوە، پارچـەی حازر چوار گۆشە، چوار گۆشـە بـڕای، لـەبن ددانـەکانی لێدەکاتـەوە دەخوا " الحمدلله " خوایە ئەو جەمەی تێرمان خوارد خوا گەورەیە بۆ جەمێکی تر، ئەوە " الـرازق "ە تەماشـا نـاوی خـوای کـە رازیقـە، ئەلێرە بەدیار دەکەوی، جا خوایەك بـی ئەوەنـدە ڕازق بـی، ئەوەنـدە عەزیم بی، ئەو چۆلەکەو ئەو تیمساحەی رزق بدا تۆ لەبیر دەکـا ، نـا سوێند بەخوا .

**پێنجەمین شت** : گوتمان : ئەو نازونیعمەتەی خوای گەورە زوو زوو بەبیرە خۆت بینەوە . بانموونەیەکتان لەبۆ بگێڕمـەوە یـەك لـە پیـاوە

چاکەکان دەمری، برادەرەکی دێتە خەونی دەڵێ : بارت چۆنە، دەڵێ بەخزمەت خوا گەیشتم لە گوناهەکانم هەمووی خۆش بوو؟ دەڵێ : بەڕاستیتە دەڵێ ئەرێ واللە، دەڵێ چۆن لێت خۆش بوو، دەڵێ : بەبیرت دێ فلانە ڕۆژی لەفلانە دوکانی دانیشتبووین؟ دەڵێ : ئەرێ واللە، دەڵێ : باسی چمان کرد؟ دەڵێ واللە باسی نازونیعمەتی خوامان کرد، دەڵێ : ئەوەندە باسی نازونیعمەتی خوامان کرد، هەموومان گریاین، گوتی : بەسایەی ئەو مەجلیسە، ئەو گریانە، خوا لە گوناهی هەرهەموومان خۆش بوو، ئەمنیش بەسایەی ئەو لێخۆش بوونەی بەخزمەتی خوای گەیشتم و بەخشیمی، تەماشا بەبیر هێنانەوەی نازونیعمەتەکانی خوا، خۆت بەقەرزار ومنەتباری خوا بزانی، لەم کاتەدا هەم خواش لێت خۆش دەبی، هەم داری خۆشەویستیت پتەوتر دەبی.

**شەشەمین شت :** شەونوێژ زۆر بکە، ئەو کاتەی خوای گەورە بەڕەحمەت وبەزەیی خۆی دێتە ئاسمانێ، بانگی بەندەکانی دەکا، کێ هەیە لێی خۆشبم، کێ هەیە تەوبەی دەکا .کێ هەیە داوام لێدەکا ، ئەو کاتە کوڕە هەستەوە هەلە، ئەلەو کاتی پەیوەندی لەگەڵ خوای خۆت ببەستە پەیوەندی توند پەیوەندی لەگەڵ " رب العالمین " ببەستە.

**حەفتەمین شت** : لەگەڵ پیاو چاکان دانیشە، ئەو پیاوانەی کە مرۆڤی چاکن لەگەڵیان دانیشە، زیاتر خوای گەورەت خۆشدەوێتن، خۆشەویستی خوای گەورەت لەدڵو دەروونت دەنیشێتن.

**هەشتەمین شت**: زۆر بیرکردنەوە لەگەورەیی خوا کە بزانی ئەو کەونە هەموو وەدیهێنراوی خوان، هەمووبەندەی خوان، هەموو یادی خوا دەکەن، بڕۆ لەگەڵ بەندەی خوای هەموو یادی خوا بکەن، بۆ ئەوەی لەو دیوی ئەو یادە، هیوادارم خۆشەویستیەك دروستبکەین، مانگی ڕەمەزانە باشترین هەلە کە شەوان لە بۆی هەستینەوە، ئەو پەیمانەی لەگەڵ خوای گەورە ببەستین، بلێین خوایە پڕ بە دڵ، پڕ بە وجودمان پڕ بە زاتی خۆمان، تۆمان خۆشدەوێ، خوایە ئەو خۆشەویستیەمان پتەوتر بکەی، ئەو خۆشەویستیەمان قوولتر بکەی، بۆ ئەوەی زیاتر تام ولەزەت لەدینی تۆ لە بەندایەتی تۆ وەربگرین، لە خوای گەورە دەپاڕێمەوە دەڵێم : خوایە لەم خۆشەویستیەی خۆت بێ بەشمان نەکەی. امین امین امین ... والحمد لله رب العالمين

*والسلام عليكم ورحمة الله وبركاته*

٢٩ ـ٣ ـ ٢٠٠٨ ـ زایینی

ڕۆژی شەممە